# میرزا مەنگوڕی

## قەڵەمێکی ئازا

ڕۆڤار

41

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات

نیگاری : نەرمین مستەفا



سەرپەرشتیاری گشتی
شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار
یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید

سەرپەرشتیاری چاپ
فەرهاد ڕەفیق

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك.
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوومانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان
سلێمانی- فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
ت: ٣١٢٩٦٠٩

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info

چاپخانەی ڕەنج



**نەرمین مستەفا**

١٩٨٠ لە تەوێڵە لە دایك بووە
١٩٩٩ بەشی نیگار کێشانیی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانیی، بە پلەی یەکەم لە سەر ئاستی پەیمانگا، تەواو کردووە.
٢٠٠٣ بەشی نیگار کێشانی کۆلێژی هونەری زانکۆی سلێمانی، بە پلەی زۆرباشە. تەواو کردووە.
وێرای بەشداربوونی لە چالاکییە هونەرییەکانی پەیمانگاو زانکۆ بەشداری چەندین پێشانگەی کردووە:
بەشداری چەندین پێشانگای ناوخۆیی لە شارەکانی هەرێمی کوردستان و عێراقدا کردووە، لەوانە: سلێمانی، هەولێر، دهۆك، کەرکوك، بەغداد.
٢٠٠٦ یەکەمین پیشانگای تایبەتی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا پێشکەش کردووە.
لەم وڵاتانەش بەشداری پێشانگایانەی کردووە: ئێران، میسر، نەرویژ، فەرەنسا
ئێستا وانە بێژە لەکۆلێژی هونەر زانکۆی سلێمانی.
وانە بێژە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی.
سەرپەرشتی هونەری گۆڤاری ئایندەیە لە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری جەلال تەقی، حەمە سالح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی.

# بەشێك لە یادەوەرییەكانم

# (1910- 1988ز)

بەقەڵەمی: میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری

هەموو كەسێك لەمەودای ژیانیدا تائەندازەیەك دووچاری بەسەرهاتێك دەبێت، بەڵام هەندێك بەسەرهاتوو و ڕووداوو بۆ عیبرەت و سوودلێوەرگرتن پتر سەرنجی خەڵكی ڕادەكێشێ، مەبەستی تایبەتی من لەم بەسەرهات نووسینەوەیە تەنها ئەوەیە كەهاوبیرو هاودەنگەكانم چەند پەندێك لەژیانی پڕنەگبەتی من وەربگرن، چونكە ئەو ڕووداوانەی كەبۆتانی دەگێڕمەوە زۆر بەگران لەسەرم كەوتوون، كەوابێ ئێوەش بێنرخ تەماشایان مەكەن.

لەڕۆژگارو چەرخی سەرسوڕهێنەرو پڕ لەسیاسەتدا ژیاون و قۆناغی لاوێتی خۆم بەسەرهاتانە دوزایی پێهێناوە:

ئەو ڕووداوەی كە كەس و كارمی گواستنەوە بۆ ناو عەشیرەتی مەنگوری لەكوردستان, لەكوردستانی ئەم دیو!

باوكم ناوی ئەحمەد كوڕی فەقێ برایمی كوڕی مەلا یوسفە, فەقێ برایمی باپیرم لەدێی سویناسی سەر بەعەشیرەتی گەورك (لەمەهابادی كوردستانی ئەودیو) دانیشتووە. ئەم گوندەش بەجێنشینگەی سەرۆك عەشیرەتی گەورك ناسراوەو سەرۆكەكانی عەشیرەتەكەش هەر لەودێیە دانیشتوون.

باپیرم خاوەنی زەوی و زارو ژیانێكی باش بووەو بەكشتوكاڵ كردن‌و ئاژەڵدارییەوە خەریك بووە، ئەودەمەی باپیرم مرد باوكم تەمەنی ٢٠ ساڵان بووەو ئامۆزایەكی بەناوی محەمەد ئەمین هەبوو كە لەوناوەدا ناوبانگی بەجوانی و خوێندەواری و ئازایەتی بڵاوبووبۆوە. محەمەد ئەمین-ی ئامۆزای باوكم لەگوندی قرزلۆی- مەنگوران حەز لەكچێك دەكات كە بەناوی (بسكێ) ئەبێ، بەڵام براكانی بەسكێ حەزناكەن خوشكەكەیان بدەنە حەمەدئەمین ئەویش بەناچاری كچێ هەڵدەگرێ!

بسكێ كە حەوت برای دەبێ هەموویان ئەكەونە دوای حەمەد ئەمین و ئەو حەوت برایە چەند خزم و خویشانی بەسكێیان بەگەڵ دەكەوێت، ئینجا لەنزیك گوندی كاولان و كورانیی ئێران (سەر بەكوردستانی ئێران) تووشی حەمەدئەمین و بەسكێ ئەبن.



حەمەدئەمین پەنا دەباتەبەر چەند ماڵە سەیدێك كە لەوناوە خەریكی مەڕ لەوەڕاندن دەبن تا لەبراكانی بپارێنەوە، بەڵكو شەڕیان پێنەفرۆشن، سەیدەكان قورئان بەرەو پیری براكانی بسكێ دەبەن و داوای چاوپۆشینیان لێدەكەن و بەڵێندەدەن كە(گوایە-ب.ا) حەمەدئەمین بەرێگایەكی پیاوانە سوڵحیان لەگەڵدا دەكات، بەڵام براكانی بەسكێ لوتبەرزانە قورئانەكە لەسەیدەكان وەردەگرن و ماچی دەكەن و پاشان پەلاماری حەمەدئەمین دەدەن! ئەو زەمانەش باوی تفەنگە شینكە دەبێت، حەمەدئەمین بەسیدەكان دەڵێ:

دووربکەونەوەو ئەوانە کوشتنیان لەسەر خۆ فەرزکرد ئیدی (ب. أ) دایان ئەگرێ ئەیانداتە بەر تفەنگ. هەتا گوللەو بارووتی پێدەمێنێ تەقەیان لێدەکات و شەش کەسیان لێ دەکوژێ، بەلام لەبەرئەوەی تاقمەکەی بسکێ زۆر دەبن و حەمەدئەمینیش هەرخۆی و دەستگیرانەکەی و دلە عاشقەکەی دەبن بۆیە بەهەر فێلێك دەبێت خزمەکانی بەسکێ ئەوو محەمەد ئەمین لەشەڕدا دەکوژن ئەمجا باوکم لەترسی دوژمنایەتی زۆری کەسوکاری بسکێ لەگەلێ خدری مامدا گوندی سویناس بەجێدێلن و دێنە ناو عەشیرەتی مەنگوری لەکوردستانی عیراق.

**ناوی عاشقێکیان لێنام!**

بایز پاشای سەرۆك عەشیرەتی مەنگور لەدێی (زودان) کەسەر بەناحیەی سەنگەسەرە باوکم دائەمەزرێنێ و ڕێزێکی باشی لێدەنێ. ئاغای سیوناسیش ناوی حەمەدئاغای گەورە دەبێ و حەزدەکات باوکم هەر ئاوا دەربەدەری ولاتان بێ بۆئەوەی مولکەکانی بۆخۆی بمێنێتەوە. باوکم لەگوندی زودان دەست بەکاسبی دەکات، زۆر دەولەمەند دەبێ و ناوبانگێکی باشی بلاودەبێتەوە هەر لەوێش دایکم کەناوی گولێ ی فەقێ وەیس بووەو بەجوانترین ژن ناوبانگی دەرکردووە، ئەهێنێت. لەم کاتەدا شاری قەلادزە ناکۆکی نێوان هەردوو عەشیرەتی مەنگورو پشدەری بەسەرەوە دەبێ، چونکە چەند سالێك پێش ئەوکاتە قەلادزە دێی مەنگوران دەبێ و پشدەرییەکان داگیری داکەن، جا ئاغای قەلادزە کە ناوی مەمەندە قیت دەبێ زۆر دلخۆشی باوکم دەداتەوەو باوکیشم بەمالەوە دەچێت بۆ قەلادزە، جا لەبەرئەوەی کەباوکم لەناو مەنگورانەوە نەقلی خانەی کردووەو چۆتە ناو عەشایەری پشدەر، بۆیە هەر بەمەنگوری ناوی دێنن، ناوی بەئەحمەد مەنگور بلاودەبێتەوەو بەناوی ئەحمەد مەنگور ناو دەردەکات، خزم و کەسانیشمان هەر بەم ناوی مەنگوری-یە ناو دەردەکەن.

لەبەر ئەو هۆیە منیش هەر بە لەقەبی مەنگوری ناوی خۆم هێناوە، چونکە بەهیچ جۆرێك پێم نەکراوە لەم ناوبانگ و لەقەبە جیاببمەوەو خۆم زۆر بەبەختیار دەزانم کەئەوە دروشم و ناتۆرەم بوو.

فامیلی ئێمە بۆتە ڕەنگێك کە بەجەوهەرەوە نووسابێ و هەندێ جاریش بەپشدەری لەقەبی خۆم نووسیوە، هەتا کتێبی (هەنگاوێك بۆ سەرکەوتن)-م لەسالی ١٩٣٧-دا بەناوی میرزا محەمەد ئەمین پشدەری چاپ کراوە.

لەسالی ١٩١٠ لەشاری قەلادزە هاتوومەتە جیهانەوە، بەناوی ئەو حەمەدەمینەوە ناونراوم کە لەسەر دلداری بەسکێ کوژراوە.

باوکم دەستێکی بالای لەپیشەو فرمانی بازرگانیدا هەبوو، زۆربەی سەفەرەکانی بۆ شارانی بەغدا، بەسرە، هەمەدان و شام بووە، کەچوون بۆ ئەو شارانە لەوکاتەدا شتێکی زۆر زەحمەت بووە. باوکم سالی ١٩٣٠ لەشاری قەلادزە وەفاتی کردووەو هەر لەوێش لەقەبرستانی داری مەلا سلێمان نێژراوە، دایکیشم لەسالی ١٩٤٢ لەشاری چوارتا وەفاتی کردووەو لەگۆڕستانی پیرالك ناشتوومە.

**ویستم مەلا دەرس بەدایکم بلێ و ئەویش لەمالەوە بەمنی بلێتەوە!**

تەربیەتی خێزانی من شتێکی زۆر سادە بوو، تەنها ئەوەندە لەخەلکی ئەو ناوە پێشکەوتووتر بووم کەباوك و دایکم زۆر هەولیان لەگەلدا داوم کەفێری خوێندەواری ببم، دایکم زۆرتر، بۆیە دەیویست ببم بەخوێندەوار، بەلکو ببم بەمەلاو پێش نوێژی بۆ خەلك بکەم و قورئانیش بۆ دایکم بخوێنم، بەئاواتەوە بوو کەبلێن کوڕەکەی باجی گولێ بۆتە مەلاو ئەمڕۆ لەمزگەوتی گەورە پێش نوێژی بۆ خەلك کرد، ئاواتی باوکیشم ئەوەبوو کەببم بەخوێندەوارو دەفتەرو حساباتی دوکانی بۆ ڕابگرم و بیحەسێنمەوە، بەلام من حەزم لەئاواتی هیچ کامێکیان نەدەکرد دەمویست نەخوێنم و هەرئەوەش ئاواتم بوو! زۆر ڕقم لەخوێندن هەلدەسا. لەخوێندن هەر تێنەدەگەیشتم، لەوزەمانەدا مەکتەب لەقەلادزێ نەبوو خوێندنیش بریتی بوو لەخوێندنی لای مەلا لەحوجرە، چونکە تورکەکان بەجەنگی جیهانی گەورەوە خەریك بوون، ئاگایان لەمەکتەب و خوێندن نەمابوو ئینگلیزەکانیش بەتەواوی دەسەلاتیان بەسەر ئەو ناوەدا پەرەینەسەندبوو کەتەرتیباتی مەکتەبی لێبکەن، چونکە لەوکاتەدا ئاغاکانی پشدەر حەزیان بەمەکتەب و خوێندنەواری نەدەکرد، نەیاندەویست مەکتەب بکرێتەوەو کوڕی کرمانج و جوتیار فێری خوێندن ببن، نەوەکو لەئاغا ڕاست ببنەوە بەربەرەکانی نفوزی بکەن.

منیان بۆ خوێندن بردە لای مەلا حەمەدەمینێکی مالخۆیزنی کە لەقەلادزە دەرسی بەمندالان دەوتەوە، مەلای قوربەسەر یەك هەفتە لەگەلێ مندا خەریك بوو تاوەکو بەحنجە فێری (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)م بکات هەر ئەو وتی: بلێ (ئەلف لەسەر ئا) من دەمووت: (ئەلف لەسەر أو)، ئەو دەیووت: ئەلف لەسەر (ئا) من دەمووت: ئەلف لەسەر (ئێ) زۆرتان سەرنەیەشێنم کولم بەمەلا داو مەلام جارس کردو خستمە سەر قونەخشکێ و لەسەر چۆکان هەلم توتاند، کەف بەدەمی مەلادا هاتەخوارێ و لەداخاندا سووروو شین دەبووەوە، نەیدەزانی چی بکات؟! لەلایەکەوە باوکم بەلێنی شتی باشی پێدابوو کە فێری خوێندنم بکات و بەلێنی مانگانەی باشی دابوێ، لەلایەکی ترەوە سەرسام ببوو کەژیان ئەوەندە ناهێنێ وا بەدیار منەوە خۆی بکا بەپەند، ئەمجار بە دلمدا هات کەدایکم بێنم بۆ حوجرەو مەلا دەرس بەدایکم بلێ و دایکیشم لەمالەوە بەمنی ڕەوان بکا، چونکە دایکم لەمن زیرەکتر بوو، وتم ماموستا فێلێکی باشم بیرکردۆتەوە هەر ئێستا دەچم دایکم دێنم بۆ بن پەنجەرەی حوجرە تۆ لەم دیوەوە دەرسەکە بەو ڕەوان بکەو ئەویش لەمالەوە بەمنی ڕەوان بکات، مەلای بێچارە زۆر بەم تەکبیرەم پێکەنی، چونکە لەپێکەنین پتر چارێکی تری بۆ نەمابۆوە، مەلای بێ تاوان بەناچاری

و لەبەر نازیرەکی دەریکردم، بەڵام کەئینگلیز هاتە قەڵادزێ مەلا مەحمود ناوێکیان بەکرێگرت تاوەکو لەسەر حیسابی حکومەتی ئینگلیز دەرس بەمنداڵان بڵێتەوە، حوجرە کرایەوەو باوکم دووبارە بردمیەوە بەرخوێندن و دامیە دەست مەلا مەحمودی جەلادی چارە قورس، بەڵام ئەمجارە لەجاری پێشوو چاکتر بووم، چونکە گەورەتر ببووم.

بەڵام هارێتی و سەرچڵیم کردبووە پیشە، پتر سەلیقەم بەپاڵەوان بازی و یاری منداڵانەوە بەسترابوو، ئەوەی کەزۆر بەتەنگیەوە نەبووم خوێندن بوو، مەلا هەر بەمە دەوەستا (فریا دەکەوت) کەسکاڵای منداڵان بپرسێتەوەو (حەسیر مەیدانم بکات) بەهەرجۆرێك بوو بەدووساڵ (جزمی عەمەم) تەواوکرد.

ڕۆژێکی سێشەممە بەهۆی مەلا محەمەدەمین شەل- ناوێکی خەلفە مانەوە خستمیانە ناو کۆڕی ئیمتیحانەوە، بڕیار وابوو کە بۆ هەر غەلەتەو دارێکم لێبدەن، بەڵام من لەو سیپارە گەورەیەدا لە سەدا دەم ڕاست نەبوو.

ئەمجا خەلفەی ناوبراو بردمیە بەردەم مەلا مەحمود- ناوی ماموستام و جەلادو قەسابی بێ ڕەحم وتی: مامۆستا گەزی چی و جاوی چی؟ بەسەری شێخ ئەمینی مندۆلان (١٠) حەرفان بەباشی نازانێ! ئەمجا مامۆستای چارە قورس ناوچاوانە تەسکەکەی وێك هێنایەو بەرگی غەزەبی پۆشی، تێگەیشتم کە بەسەرهاتی ئەمڕۆم



لەرۆژەکانی تر خەتەرترە، خۆم کزۆڵە کردو بەهەناسە بڕکێیەکەوە دەستم بەبەڵێن و پاکانەی گەورە گەورە کرد کەئیتر لەمەولا باش بخوێنم، بەڵام کار لەکار ترازابوو، درۆو دەلەسەو فێڵبازی شوێنێکی خاوێنی بۆ نەهێشتبوومەوە لای مامۆستای بەرێزم، ئەمجا منداڵانی نارد بۆ ئەوەی شوڵە هەناری بۆ بێنن تاکو دارکاریم بکات, منداڵە داغدارەکانیش چوون باوەشێك شووڵە هەناریان لەباخچەی مزگەوت بڕی و لەخزمەت مامۆستای بەرێزیان دانا، بەدوو شاگردی پەل ئەستوور قاچیان (فەرانقە) کردم، جا (کوزە کوتی) بکوتە کوێت دێشێ؟! ئەو هەموو شولە هەنارە نەرم و شلانەی لەقاچ و لەشما ورد کرد، هەتا هەناسەی سوارتر دەبوو پتر تووڕەو غەزەبی پتەو دەبوو.

ئەوەی کەزۆری بەزەیی پیاما دەهاتەوە محەمەدی خەلیفە قاسم ناوێك بوو کە لەژێرەوە پێی دەوتم: بگری، بەڵکو نەزەری دیقەتی دایك و باوکم جەلب بکات و تورەبن و پێم نەخوێنن!

## چۆن مامۆستاکەم بەلێدان دا؟!

مامۆستای بەرێزیشم سەری گەرم ببوو لای وابوو هەر کە لەلێدانەکەی من ببێتەوە باخەڵی پڕدەکەن لەپارەو پاداشتی ئەو تێکۆشانەی ئەدەنەوە کە لەگەڵ مندا کردوویەتی!

جارجارەش بەدەنگێکی بەرز جنێوی بەمنداڵەکان دەدا کەشووڵە هەناری ئەستوورو بەقەوارە ترینیان بۆنەهێناوە، شووڵە هەنار بران، لە (فەرانقەی) سز کرامەوە، بەڵام قاچم عەرزی نەدەگرت، لەبەر ئازار نەمدەوێرا قاچم بخەمە سەر زەوی، منداڵان کەوتنە ژێر باڵمەوە، بە حینگە شەلێ بردمیانەوە بۆ ماڵەوە کەماڵەکەمان بەسەر مزگەوتەکەوە بوو ئەمجا دایکم کەمنی ئاوا بەزەلیلی دی هەموو سەرو پرچی خۆی ڕووتانەوەو بەچەپۆك وەرگەڕایە خۆی، هەر خۆم دەزانم چەندم بۆ گریا، چونکە تاقانەیەکی خۆشەویست و بەجێی هیوای پاشەڕۆژی بووم باوکیشم کەهاتەوە منی بەوحاڵە پەرێشانە دی، چووە سەر مەلای ناوبراوو بگرەو کوێت دێشێ!؟ زۆری سووکی بەسەر مەلای بێچارەدا هێنابوو بەسەر ئەو جوڵانەوە دڕندەیەی کە لەگەڵ من بەکاری هێناوە، منیش خۆم کزۆڵە کردبوو سەرم لەسەر ئەژنۆما شۆڕکۆدبۆوە، وەکو کەسێك کەناهەقیەکی لەگەڵدا کرابێ!

مەلا محەمەدەمین-ی حەمە موفتی قەڵادزێ زۆر دڵخۆشی باوکم دەداتەوە کە بۆ حەمەدئەمین بەپەرۆش نەبێ و هیوای وایە کەئەمجارە ببێ بەکوڕێکی باش و کۆترەکانی مزگەوت و خانەقاش لەچنگ بەردەفڕکێی ئەو ڕزگاریان ببێت.

## ئینجا بڕیارمدا ژیرو ئاقڵ بم!!

زۆرتان سەرنەیەشێنم بۆ مەودای ١٠ ڕۆژ قاچیان گرتمە هەویر هەتا قاچم هاتەوە سەرخۆی، ئەمجا باوکم وتی مەلایەکی تر هەیە بچۆ لەلای ئەو بخوێنە، منیش وتم هەرگیز ناخوێنم، باوکم وتی ئەگەر نەخوێنی دەبێ ببی بەشوانی مەڕەکانمان، وتم: ئەوەیان دەکەم، ئەمجا لەترسی خوێندن و مەلا مەحمود بووم بەشوان, لام وابوو شوانی لەخوێندن ئاسانترە، نزیکەی ٢٠ ڕۆژ شوان بووم، بەڵام شوانی زۆر ناخۆش بوو.

دەبوو لەسەگەکان وریاتر بم، ئاودان و مۆڵکردنیان زۆر بەئەرك بوو، بەتایبەتی دوو بزنی زۆر بەدخۆیان تێدابوو کە لەبەر

چەمووشی ساتێك نەیاندەهێشت بسرەوێم، مەڕەكانم بەسەر باوكمدا دایەوە!

(وەلی) خاڵم دووبارە خرایەوە بەر جەفای بزنە ڕەش و شینكالەكانەوە ئەمجا بەبێ پرس و فەرمانی باوكم هەر لەخۆمەوە چوومەوە بۆلای مەلا مەحمودی ماۆستای بەنرخ و بەڕێزم، ئەمجارە بەراستی خۆمدایە خوێندن، ڕەوشتی ئەخلاقی خۆم ڕێكخست، هەر ئەو ساڵە قورئانم بەبێ گرفت تەواوكرد، دەوری سەركێشی و پاڵەوانبازی ناومنداڵانم فرێدا، جەفای ئەو دوو بزنە قوڕم ساغانە منیان كرد بەشاگردێكی ژیرو هێمن.

## گەورەكان شۆڕشیان دژی ئینگلیز كردو ئێمەش لەماۆستاكەمان هەڵگەڕاینەوە

دایكم كەوتەوە سەر ئەو هیواو ئومێدەی كەبۆی ببم بەمەلاو سەرفترەو زەكاتی بۆ وەربگرم، بەڵام لەساڵی ١٩٢٢دا لەژێر فەرماندەیی (عەبدوڵڵا شەفیع) كە بەئۆزدەمیر پاشا ناسرابوو لەدەربەندی ڕانیە شۆڕش لەدژی دەوڵەتی ئینگلیز دامەزرا، عەباس مەحمود ئاغای پشدەری لەگەڵ غەفوور خانی ئەندزەو مامەند ئاغای ڕەئیس عەشیرەتی ئاكۆ-بوون بەهاوپەیمانی عەبدوڵڵا شەفیع و ئینگلیزیان لە (دەربەندی ڕانیە) دەركرد بەناوی شۆڕشی ئیسلامییەتەوە كوشتارێكی باشیان لەئینگلیز كرد.

هەر لەگەڵ ڕۆیشتنی ئینگلیزەكان، مەلا مەحمودی ماۆستاشم مانگانەكەی لای ئینگلیزەكان برا، عەبدوڵڵا شەفیع (ئوزدەمیر) فەرماندەی توركەكانیش خوی ملوموشی پارە كۆكردنەوەی دەكرد چ جای ئەوەی بتوانی بۆ مەلای ماۆستام مانگانە ببڕێتەوە، تەنها مەوریدی ژیانی مەلا مەحمودی ماۆستا هاتە سەر مانگانەی ئەو منداڵانەی كەدەرسی پێ دەوتن هەریەكەی لەسەری مانگدا یەك ڕوپیەیان پێدەدا، لەم كاتە ناهەموارو تەنگ و چەڵەمەیەدا خروی شۆڕش و تۆڵە ساندنەوەم كەوتە لەشەوە، (٣٠) شاگردم لەمنداڵەكانی (حجرە) هەڵگێڕایەوە كە لەلای (مەلا محەمەدی دیلۆیی) بخوێنین بەم بەڵگەیە كەمەلا مەحمود فارسی باش نازانی، مەلا محەمەد دیلویی لەراستیدا زۆر خوێندەوارو خەتات و فارسی زان و سەنعاتسازو شاعیرێكی باش بوو، بەم كردەوەیەم مەلا مەحمود شیرازەی ژیانی پس پس بوو!

دەردی هەژاری پاڵی پێوەنا كەبچێتە لای حاكمی قەڵادزە بایز هەباس ئاغا- ناو كەنایبی ئوزدەمیر پاشا بوو، لەجێگای بابەكری سەلیم ئاغای كۆنەدۆستی ئینگلیزەكان كرابوو، بەحاكمی شۆڕش لەقەڵادزەدا.

باوكم لەوكاتەدا توتنی بردبوو بۆ (بەسرە)و لەقەڵادزە نەبوو، جەندرمەی بایز ئاغا من و منداڵە هەڵگەڕاوەكانیان برد بۆ بەردەمی بایز ئاغا لەپاش وتووێژێكی زۆر بایز ئاغا وتی: (ئەگەر نەچنەوە لای مەلا مەحمود هەمووتان دەخەمە زیندانەوە، هەر بەبیستنی پیتی زیندان چەند منداڵێك نەبێ هەموویان بەڵێنیاندا بچنەوە لای مەلا مەحمود، بەڵام من و چەند منداڵێك هەر لەسەر مانگرتنەكە ماینەوەو بۆ مەودای چەند سەعاتێك زیندانیان كردین، بەڵام (ساڵح بەگی لێفە سوتاو) كەنوێنەری بایز ئاغا بوو هاتە زیندان و بەرەڵای كردین، ئێمە هەر لای مەلا دیلۆیی) ماینەوەو منیش تۆڵەی ئەو لێدانەم لە ماۆستا مەلا مەحمود كردەوە، هەرچەندە كەسەلیقەیەكی بێ وەفایم لەگەڵدا بەكارهێنا! خوێندنی فارسیم تەواوكرد، ئەو كتێبانەی كەباوبوون خوێندمن وەكو (كلیاتی سعدی شیرازی) لەگەڵ گوڵستان، بوستان، یوسف و زلیخا، تاریخ نادری، تاریخی معجم)، مامەوە، چونكە لەقەڵادزە كە لەتەشكیلاتی میری بێبەش بوو، مەكتەب نەبوو، نەشم دەویست خوێندنی مەلایانە بخوێنم و بچمە ناو فەقێیان، ئاواتی دایكم پێك بێنم و ببم بەمەلاو لەمزگەوتدا بۆی ببم بەڕاوێژكەر.

## لەكۆیە بزر بووم و هەر لەوێش كەڵكەڵەی سەفەری بەغدام كەوتەسەر!

لەساڵی ١٩٢٢دا باوكم ٤٠ فەردە توتنی بردبوو بۆ (بەسرا) نزیكەی شەش هەزار ڕوپیەی قازانج كردبوو، تەماعی ئەو قازانجە هانی دابوو كە لەساڵی ١٩٢٤دا (٢٤٠) فەردە توتن بەهۆی (میرزا فەرەجی حاجی شەریف)ی بەندەرچی-یەوە بەرێ بۆ بەغدا.

لەلایەن میرزا فەرەجەوە (٣٢) هەزار ڕوپیەی ڕەسمی دوخانیاتی بۆ بدرێ، شەش مانگ بوو باوكم و خدر مەنگوری مامەم بێ خەبەر بوون، ئیزنم لەدایكم وەرگرت كەبچم بۆ كۆیە، بەڵكو تەلەفۆنێك لەگەڵ باوكمدا بكەم، چونكە لەو دەورەدا لەنێوان بەغداو قەڵادزە هیچ هۆیەك نەبوو بۆ موخابەرەو یەكتر دواندن.

پەیوەندی نێوان كۆیەو بەغداش تەنیا (كەڵەك)و وەلاغ بوو، شەمەندەفەرو ئۆتۆمبێل چاوی بەو ناوچانە نەكەوتبوو، لەسەر ڕەزامەندی دایكم چووم بۆ كۆیە هەر كەپێم نایە ناو شاری كۆیە سەرم سوڕما، چونكە شاری وا گەورەم نەدیبوو كۆیە بەنسبەت قەڵادزە نیمچە لاهووریك بوو، لەبەر خۆمەوە دەموت تۆ بڵێی هیچ شارێك لەكۆیە گەورەتر بێ، كەچاوم بەپۆلیس كەوت، واقم وڕما.

دەمووت كەسێ بێ بتوانێ لەم چارە قورسە ناشرینانە بڕوانێ زراوی نەچێ، چونكە پۆلیسیم نەدیبوو، زۆریان لێدەترسام نەمدەویست بیانبینم بەتایبەتی نیشانەی سدارەكانیان شتێكی زۆر بەسام بوو، بەهەر جۆرێ بوو بەهۆی شارەزاوە گەیشتمە ماڵی (مام حسێن قالە پەرە)ی سەرۆكی قافڵەچی نێوانی قەڵادزەو كۆیە، (مام حەسەن- ئاشنایەكی زۆر دڵسۆزی باوكم بوو) هەر ئەو ڕۆژە لەكۆیەدا دەستمكرد بەگەڕان لەكۆڵانێكدا ڕێگای ماڵی مام حەسەنم لێ تێكچوو، هەموو كۆیەم پشكنی ماڵی خانە خوێم نەدۆزیەوە، بەڵام شەفیقی زركوڕی مام حەسەن-بەدواما گەڕابوو هەتا دۆزیمیەوە، بەیانی بەهۆی (مالموك) ناوی جولەكەی كۆیی كەئاشنای كاسبی بوو لەگەڵ باوكما، تەلگرافێكم بۆ باوكم لێدا

لەرۆژی دوایی وەڵامی تەلەگرافەکەم وەرگرتەوە کەدەڵێ هەتا ئێستا توتنەکانمان نەفرۆشراون، ئەمجا لەدوای چاوکرانەوەم لەکۆیە کەڵکەڵەی سەفەری بەغدام کەوتەسەر!

ئەو (کەڵەکەوانەی) کە (٢٤٠) فەردە توتنەکانی بۆ باوکم بردبوو بۆ بەغدا ناوی (خەتاب) بوو خەڵکی (ئاڵتون کوپری) بوو، لەوکاتەی کە من لەکۆیە بووم ئەویش لەوێ بوو، لەگەڵ ئەوا خۆم ئامادەکرد بچم بۆ بەغدا، هەرچەندە کەمام حەسەنی خانەخوێ-مان بەسەرما هاتوو بەخەتەری ڕێگای بەغدا ئەیترساندم، بەڵام لەبڕیارەکەی خۆم پەشیمان نەبوومەوە. ئامۆژگارییەکانی مام حەسەن و ئافیە خانی ژنیم بەقەدەر خۆشیەکەی بەغدام بەلاوە مەبەست نەبوو، قاقەزێکی خواحافیزیم لەگەڵ ئەسپە کویتەکەماندا بۆ دایکم ناردەوە، ئای دایکە هەژارەکەم چ شێوەنێکی بۆ گێڕابووم کەوا بەمنداڵی دەربەدەری وڵاتان بووم، چونکە سەفەری بەغدای ئەو (حەلە) گاڵتە نەبوو، کەسێ کەچوبا بۆ بەغدا هەتا خوارماڵان بەڕێ دەکراو ئازایی لەگەڵ دەکرا.

(١٥) ڕۆژ دەبوو بەسواری (کەڵەک) بەناو زێی گەورەدا بڕۆی، بەڵام من لەکوێ و شیوەنی دایکم لەکوێ، بەڵام باوکم کەبیستبووی وا لەکۆیەم، لەبەغداوە بەئاسیاوێکدا دارجگەرەیەکی (سەندەلوسی زەردی) لەگەڵ دەستێك ڕانکوچۆغەی زاخۆیی و پشتێنێکی کریشەی زەردو پاپوجێکی ئاغزونەداری بەغدادانەی لەگەڵ (قەڵەم بڕێکی دەسك سپی)و مشکی-یەکی ڕەشی بۆ ناردبووم، کەئەو شتانە بەرامبەر بەوکاتە نمونەیەکی تاقانەیی و خۆشەویستی بوو، کابرا جلەکانی دەفریای سەفەری بەغدا خستم، چونکە هەتا (کنگربان) خەتی، شەمەندەفەر- هەبوو لەوێشەوە بە وڵاغ هاتبووە کۆیە، ئەمجا کەچاوم بەو کەلوپەلانە کەوت پتر خولیایی بەغدام کەوتە سەر، کە لەبەغدا شتی واجوان هەیە، ئەمجا لەگەڵ (خەتاب) ئاوا چووم بۆ دێی (تەق تەق)و بردیانم بۆ ماڵی (کاکە ڕەشی) تەق تەقی کەزۆر ئاشنای باوکم بوو، لەلایەن کاکە ڕەش و ئافیەی خوشکییەوە زۆر پەزیرایی کرام من بەپەلە بووم، بەڵام کەڵەکەکەی خەتابیش وازوو حازر نەدەبوو خەتاب- ناچار بوو کەبمداتە دەست عماد ناوێکی تکریتی کەکوڕەکەی ناوی (بەزون) بوو ئەویش هەر کەڵەکەوان بوو، بەومەرجەی کە لەبەغدا بمدەنە دەست باوکم لەخانی میرزا فەرەجی حاجی شەریف- کەکەوتۆتە سەرجادەی (رنگ چا) لەوسەفەرەما نوری ناوێکی کۆیە لەتەمەنی ٢٠ ساڵیدا بوو بەهاوڕێم ئەویش باوکی لەبەغدا سەعاتچی بوو بەناوی مەلا ڕەئوف سەعاتچییەوە دەچوو بۆ زیارەتی باوکی، مستەفا ناوێکی کۆییشمان لەگەڵ بوو بەئاوەڵ کەتەمەنی لە ٤٠ ساڵی تێپەڕ بووبوو.

لەسنوری شاخی حەمرین، حەویجەییەکان ڕوتیان کردینەوە!

ئەمجا (کەڵەك) بەرەو بەغدا کەوتەرێ، بەغدا بگرەو هاتم، ئای لەو خۆشییە کە (کەڵەك) کەوتە جوڵان و ناو شەپۆلی زێ، خوشکە جوان کێلانەکەی کاکە ڕەش تویشوی ڕێگای بەغدای بۆ ڕێکخستبووم، چونکە ئەو دەیزانی کە لەرێگای بەغدا چەند وێنە جەفای ناهەموارم دێتە سەر ڕێ، بەراستی چاوئەندازی کەڵەك زۆر خۆشبوو ئەگەر لەوکاتەدا دایکم بیرنەکەوتبایەوە کەوا شیوەنی گێڕاوەو ژنانی دەرو دراوسێشی لێ کۆبوونەتەوە بۆ (حەمەدەمین) دەلاوێنیتەوە چاوئەندازی شەپۆلە سپی و سولەکان لەکاتی گزنگ پەڕینی ڕۆژئاواوە تیشك پەخشانی ڕۆژهەڵات زەوقێکی شاعیرانەی دەخستە کەللەمەوە، هانی دەدام بۆ شیعر ڕێکخستن، بەڵام ئەوەندەم توانا نەبوو کەئەو شێوە نازدارانە بخەمە ناو چوارچێوەی هەڵبەستەوە، بەم دەستوورە گەیشتینە (یەکاوی موسڵ) پێمان نایە ناو تەنگە بەراییە شاخاوییەکەی (جبل حمرين) کەوتینە نێوانی دوو شاخی بەرزی (جبل حمرين) (سنوری کوردستان) ئەوەندەم زانی لەبەری شاخی (حەویجەوە) دایان گرتین بەهێرشی تفەنگ، لەسەر کەڵەك بوو بەشین و هاوارو پاڕانەوە لەترسی گوللەی پیاو خراپەکان خۆمان کوتایە پاش فەردە توتنەکان ئێمەو کەڵەکەوانەکان (١١٢) کەس بووین ئێمە بێ چەك ئەوان چەکداربوون، بایەکی توندی دەهات نەیدەهێشت (کەڵەکەکە) دووربکەوێتەوە کەڵەکەکەمان- لەخۆیەوە چووە بەردەستی چەتەکان و ئەو ڕێگرانە چەتەی عەشایری (شەقەر) بوون، چەتەکان هەڵیان کوتایە سەر (کەڵەکە)کە ٦٠٠ فەردە تووتنی بەسەرەوە بوو، دو کەڵەك بوو لێکدرابوون، ئەو ڕووداوە لەمانگی تەموزی (١٩٢٤)دا بوو، هەوا زۆر گەرم بوو، بڕیار وابوو ئەگەر بگەینە تکریت (مستەفا) ناو لەسەر حسابی باوکم کەپرێکم لەسەر کەڵەکەکە بۆ دروستبکات ئەوەکو هەتاو نەخۆشم بخات، بەڵام ئەو هەلەمان نەما، چەتەکان هاوەڵەکانمیان یەك بەیەك ڕووتکردەوە، دەستیان لەمن نەدا، چاو ئەندازی نوری هاواڵم لەوکاتەدا زۆر بەلامەوە سەیربوو کەوا بە ڕووتی هەڵتوتکاوەو لەبەر قرچەی گەرما لوتی داژەنیوە نوری و ئاوەڵەکانم دەگریان و منیش پێیان پێدەکەنیم، چونکە هیچیان لەمن نەکردبوو، کیسە باخەڵەکەم کە لیرەیەکی ئاڵتونی تێدابوو، لەگەڵ قەڵەمبڕو دارجگەرەکەم خستبووە ژێر گونیەیەکەوە، لەسەری دانیشتبووم شام بەسەپانی خۆم نەدەزانی، هەر ئەوەندەم زانی چەتەیەکی عەرەبی لینگ درێژ هات و وتی: (گوم) منیش عەرەبیم نەدەزانی لام وابوو دەڵێ باش دابنیشە، گورج بۆی لەسەر چیچکان دانیشتم و چرکەم لەخۆم بڕی، کابرای چەتە (شەقازلەیەکی) لێدام و ڕووتی کردمەوە، جلە جوانەکانی لەبەر داکەندم گونیەکەی هەڵدایەوە کیسە باخەڵ و دارجگەرەکەی دۆزیەوە، بۆ بردنی دارجگەرەکەم زۆر بەپەرۆش بووم لام وابوو بەغدا هەر ئەو دارجگەرەیەی تێدابووەو دارجگەرە چنگ ناکەوێتەوە!

بەقورە قورو لوشەلوش، دوایی کابرای چەتە بۆی چووە سەر بەردێك، پیرەدار جگەرەکەی لەقوتویەکی تایبەتی دەرهێناو پێی شتێکی جوان و عەنتیکە بوو منیش خۆم گەیاندە کابرای چەتە دەستم بۆ دارجگەرەکەم درێژکرد کەلێی وەربگرمەوە کابرا لولە

تفەنگەکەی بۆ ڕاکێشام کە بمکوژێ لەترسی لولە تفەنگی کابرا بەگوڕ خۆم بەکەڵەکەکەدادا– دوو کوندەی کەڵەکەکەم لەژێر پێدا دڕا (بەزون) ناوی کەڵەکەوان غاری دامێ کە لێم بدات، کابرای چەتە تێی خوڕی و شەقازلەیەکی لە (بەزون)دا، بانگی کردم جلەکانی هەموو دامەوە تەنیا دارجگەرەو بارەکەی بردم ئەمجا لەو خۆشی وبەختیارییە کەوا خۆم بەپوشتەیی بینیوەو نوری ئاوەڵیشم بە (روتی) بوخچەیەکی سووری جوانم پێ بوو کەئامینەی خوشکی کاکە ڕەش تێشووی نانی بۆ تێ خستبووم دام بە (نوری) لەخۆیەوە پێچا.

نوری خۆی سورکاڵ بوو بوخچەکەشی سووربوو هەر لەمەیمونی دەکرد کە لەسەر چیچکان هەلتووشکابوون، ئەوەندە بەنوری پێکەنیم کەڵەکەوان و دزەکانم وەك یەك هێنایە پێکەنین، نان و خواردەمەنییەکی کەپێمان بوو هەموویان برد، هەتا بانگی شێوان لەناو کەڵەکەکە حەپس کرابووین، کە شەو هات چەتەکان ڕۆیشتن و ئێمەشیان ئیزن دا شەو برسیمان بوو کەڵەکەکەمان لەنزیك خەلیلێك لادا کەڵەکەوانەکان ڕۆیشتن منیان بەتەنیا بەدیار کەڵەکەکەوە بەجێهێشت، لەدرەنگیشدا هەموو لایەکیان هاتنەوە شووتییەك و هەندێك (ئاردیان) بۆ هێنابووم، عماد– هەروا بەگورجی هەویرەکەی شێلاو ئاگرێکی بەپشقلی حوشتر کردەوەو هەویرەکەی خستە ژێر ئاگرەکە بۆی کردم بە (گونك) بەمانا هەویری پیشاو، نوری هات وتی: تێرم نەخواردووە نەختێکم لەو (کوکەیە) بدەرێ، هەرچییەکم بوو لە (کوکە)کە کردەوە، بەپەلە خستیە دەمییەوەو خێرا تفی کردەوەو وتی: (ئای خۆ هینەکەی من پڕە لەخشپڵ) کەسەیرم کرد ڕاست دەکات تومەز هەویرەکە شل بووەو خشپڵەکانی خستووەتە ناو خۆیەوەو لەکاتی گەرم هاتن و پیشانا وەکو (تەحلیلی کیمیاوی) لێی هاتبوو هەرچۆنێك بوو ئەو شەوەمان لەقەراغی خەلیلەکە ڕابوارد، بەیانی گەیشتینە (تکریت) خەڵکی تکریتمان لێ کۆبوونەوە حیکایەتی خۆمان بۆ گێڕانەوە.

**دۆستێکی دێرین لەتکریت فریامان کەوت**

بەغداد–تکریت (شەش ڕۆژە ڕێ بوو)، هیچ خواردن و پارەمان پێنەمابوو ئەگەر وانەبووایە بڕیار وابوو (مستەفا) کەپرێکم بۆ لەقامیش دروستبکات، بەڵام ئێستا خەیاڵی کەپرو کورە بازرگانیم لەسەرا نەماوە، پەلەقاژێی ئەوەمە چی بخۆم بەچی بگەمە بەغدا. جارجارەش دایکمم ئەهاتەوە بیر ئەمووت ئەگەر دایکم لەکونێکەوە چاوی لێمەوە بووایە ئەبوو چی بکردایە، بەناچاری سەرم ئەخستەوە سەر ئەژنۆی برسێتی، کەچاوم بەمیوەو شەربەتی ناو بازاڕو چایخانەکانی تکریت دەکەوت زۆرم بەزەییم بەخۆمدا دەهاتەوە کەدەسەڵاتی یەك شەربەت و چایەکم نییە, پتر بیرم لەم ڕێیە دووروودرێژەی نێوانی بەغداو تکریت دەکردەوە، ئەوەندەم زانی پیاوێکی عەرەبی تکریتی و درێژی وێنە (داهۆڵی تاك لایتی یەك چاو) هاتە سەر کەڵەکەکە بەکوردی لێی پرسیم تۆ خەڵکی کوێی؟ وتم: قەڵادزە. کوڕی کێی؟ وتم: ئەحمەد مەنگور. وتی: تۆ حەمەدئەمینی؟ وتم: بەڵێ.

یاران کەکابرای عەرەب کتوپڕ ناوی هێنام چۆن گەشکە بووم لەخۆشیانا لەدڵی خۆمدا وتم: تۆ بڵێی ناسیاوی باوکم بێ و شەربەتێکم بۆبکرێ! وتی: تۆ من ناناسییەوە وتم: نەوەڵڵا وتی: من حسێنم ئەی چەند جار هاتووم بۆ ماڵی ئێوە؟ باوکت ترش و گوێزو کەتیرەو مازووی بۆ کڕیووم، ئای وەڵڵا ڕاست ئەکەیت پارەت پێیە شەربەتێکم بۆ بکڕیت؟ ئەیچۆن هەرئێستا ئەتبەمەوە بۆ ماڵی خۆمان، من قەرزاری چاکەی باوکتم، ئای چەندە بەخۆشی و بەختیارییەوە دوایی بەم تەنگانەیە هێنا، فریشتەی ڕزگاری هاوراهی کردم پەلی گرتم و بەئاگاداری مستەفا بردمی بۆ ماڵی خۆیان ژنێکی خنجیلانەی ئەسمەر ڕەنگی هەبوو، هەر لەدوورەوە حسێن لەگەڵیدا کەوتە وتووێژ، بەڵام چونکە عەرەبیم نەدەزانی تامم لەراوێژەکانیان نەدەکرد، خواردنی زۆر باشیان دەرخواردام، ئێوارە لەگەڵ حسێندا چووینەوە بۆسەر کەڵەکەکە، تەماشام کرد نوری بوخچە سوورە گوێنییەکەی لەخۆپێچاوە لەژێر سێبەری فەردە تووتنەکان لەبرسدا خەوی لێکەوتووە.

نوری! نوری! هەستە هیچت خواردووە؟ نوری لەخەو ڕاپەڕی، وتی: تەنها ژنێك دوو نانی بۆم هێناوم، وتم: دەهەستە وەرە بابچین بۆ چایخانە ئاشنایەکی باوکم دۆزیوەتەوە چەند بخۆین ئەماندات، ژنەکەی زۆر لەخۆی ڕوخۆشترو چاکترە، ئەو شەوە هەردووکمان لەماڵی حسێن ڕامانبوارد، ڕۆژی دوایی حسێن نیو ڕوپیەی لەگەڵ کەوا کونێك دا بەنوری (دوو ڕووپیەشی) دابەمن ژنەکەشی بوخچەیەکی نان و خواردەمەنی بۆ ڕێکخستم و کەڵەك بەرەو بەغدا کەوتەڕێ و بای ناهەموار دەستی بەجوڵانەوە کردو شەپۆلەکانی ئاو بون بەهۆی نەڕۆیشتنی کەڵەکەکە وەکو موساو (بەسەرهاتی بەنی ئیسرائیل)مان لێهات ڕێگای شەش ڕۆژمان لێبوو بەرێگای ١٢ ڕۆژ پارەو توێشوو دوایی هات، بەرۆژ ئەڕۆیشتین و ئێواران لەکەنارێك لەنگەرمان دەگرت، منیان بەدیار کەڵەکەکەوە بەجێهێشت ئەوان ئەڕۆیشتن بۆناو خێڵی عەرەبەکان بۆ (ملومۆش) لەگەڕانەوەیان نان و شتیان لەگەڵ خۆیان بۆ دەهێنام.

ئێوارەیەك کتوپڕ گەیشتینە ناو شاری الاعظمیة ئای لەو سەیرانگە سەرسوڕهێنەرە، تۆ بڵێی ئێرە بەغدا بێ یا وڕێنەی برسێتی ئەوەم نیشان ئەدا؟ خۆ ئێرە لەکۆیە گەورترو خۆشترە، بەم سەرسامیەوە کەڵەکەکەمان لەخوار نەخۆشخانەی (مجیدیە) لەنگەری لادا، لەکەڵەکەکە دابەزیم، ئەوە هەوەڵ جارە کەچاوم بەئۆتۆمبێل و عەرەبانە ئەکەوێت ئای بەخوا شتێکی سەیرن، هەر ئەوەندەم زانی لەناکاو گڵۆپی ئەلکتریکەکانی بەغدا داگیرسان، بەراستی ئەو چاو ئەندازەم بەلاوە شتێکی سەیر بوو کەوا وێنەی گڵۆپەکان لەناو ئاوی دیجلەدا ئەترووسکانەوە، ئێرە لەکوێ و قەڵادزەی پڕ لەوەحشیەت و

نەزانین لەکوێ؟ دەمم بوو بوو بەتەڵەی تەقیو، هەرچەندم ئەکرد نەمدەزانی سەیری چی بکەم, لام وابوو لەژێر ئاویشا هەمان شارو کارخانەو ئەلەتریك هەیە، نەم ئەزانی کەوا وێنەی کارەباو خانوو حەزارەتی سەر زەوییەو (انعکاسی) بۆ ئاوو هەواو شەپۆل کردووەو ئەیان جووڵێنێ، چایخانەیەکی بچکۆلانە لەقەراغ شەتەکە نزیك بەکەڵەکەکەمان بوو، بەنوریم وت ئەگەر هیچ پارەت پێیە بابچینە ئەو چایخانەیە؟ نوری وتی دوئانەم پێ ماوە، لەگەڵ نوری سەروچاومان بەو دوئانەیە خواردەوە، ئەو شەوە لەسەر کەڵەك-لێی خەوتین، سەر لەبەیانی عەرەبانەی توتن گواستنەوە گەیشتە بەردەمی کەڵەك.

کابرای عەرەبانچی خۆم بەفەردە توتنەکانەوە نووساند, هەر ئەوەندەم زانی قەمچییەکی تێ سرەواندم چزەی لەپاش ملم هەڵساند، بەقەمچی لێدان فرێی دامە خوارەوە.

توتنەکانیشی لەعەرەبانەکە فرێدایە خوارەوەو بۆی دەرچوو بەبێ هیچ راسپاردەو راوێژێك منی لەوێ بەجێهێشت، منیش بەسەرسامی لەبەردەرگای خانەکە وەستابووم وەکو کێوێك کەبکەوێتە داوی شارستانیەتیەوە، نەمدەزانی چی بکەم و بۆ کوێ سەری خۆم هەڵبگرم، عەرەبی نازانم لەکەسێك باس و خواسی باوکم پرسیار بکەم، فارسیم دەزانی لام وابوو بەفارسی قسەکردن باسی



### لەبەغدا گوتم توتنی ئەمساڵ کولله خواردوویەتی!

لەپاش ڕۆشتنێکی زۆر عەرەبانەکە لەبەر قاپی خانێك ڕاوەستا، کابرای عەرەبانچی خۆی فرێدایە خوارەوە بەتووڕەییەکەوە بەمنی وت (انزل) منیش وامزانی ئەڵێ خۆت توند بگرە، ئەمجا لەترسی

سەرو تێداچوونمە کەسێکیشم نەدەدی کەجلی وەکو منی لەبەرا بێ و بچم بەلایەوەو بەکوردی بیدوێنم سەرلێ شێواوو غەمگین دڕۆش دامابووم بیرم لەپاشەڕۆژی خۆم دەکردەوە هەر چاوم دەگێڕا بۆ باوکم، باوکی چی؟ ئێرە بەغدایە، هەزاری وەکو تۆو باوکتی تیا سەرئەنگوم کراوە، لەدالغەی ئەوەدا بووم کەسەرەو خوار تێتەقێنم،



جارجارەش ئەمووت: بۆ کوێ بچم، لەکوێ باوکم بۆ دەدۆزرێتەوە؟ خوا دەزانێ باوکم بۆتە چ شینە عارەبێك؟! ئەوەندەم زانی پیاوێکی جل شۆری نەختێ ناوکەوتووی باڵادرێژ ڕووی تێکردم، وتی: هۆی (حەمەدەمین) بەخێربێی، ئەوە لەکوێوە هاتووی؟ یاران وەکو بەئاوی ڕەحمەت ئاوپرژێنی دڵم بکەم ئاوا گەشامەوە، کەناوی خۆم ئاوا بەسادەیی بەسەردەمی کوردییەکی هاوزمانی خۆم بیستەوە، وتم تۆ کێی؟ وتی من (مام سادق)ی باوکی (مامەی) برادەرتم، بۆچی من ناناسیتەوە، ئەی ئێمە لەقەڵادزە دراوسێ نین؟ وتم ڕاست دەکەی، بەڵام باوکم لەکوێیە؟ وتی لەگەڵ باوکت بەیەکەوە لەم (خانەین)، ئێرە خانی میرزا فەرەجی حاجی شەریفی بەندەرچییە هەردووکمان چووین بۆ چایخانەیەك کەنزیك بەخانەکە بوو، چایچییەکە ناوی (قاسم) بوو خەڵکی ئێران بوو، بەفارسی بانگیان دەکرد قاسم چای بیار قاسم آب بیار؟ ئەمجا زانیم کە بەفارسی دوان هیچ قەدەغەیەکی بەسەرەوە نییە! تۆزێك خۆم (بزەڵە) کردەوە ئەمجا کەبزریش ببم دەتوانم بەفارسی بدوێم و شوێنی خۆم بدۆزمەوە، بەڵام (مام سادق) لەرێوە تەوسیەی کردم ئەگەر کەس لەبارەی کشتوکاڵی توتنەوە پرسیاری لێ کردی بڵێ توتن نەماوە (کوللە) هەمووی خواردووە ئەمساڵ توتن نابێ، بەڵکو خوا بکات بەندەرچییەکان بازاڕێك بۆ توتنەکانمان بدۆزنەوەو توتنەکانمان بۆ بفرۆشرێ، کوردەکان لەو چایخانەیە کۆبوونەوە، هەموویان دەستیان بەزاخاوی توتن سوتابوو، لەسەر قسەی مام سادق دەنگێکم لەبازاڕی بەغدا بڵاوکردەوە کەتوتن ئەمساڵ کوللە خواردویەتی، لەوقسانەدا بووین باوکم دەرکەوت، لەخۆشی باوکم هەتا (٣) سەعات نوریم لەبیرچۆوە ئەمجارە بەسەرهاتی نووریم بۆ مەلا ڕەئووف گێڕایەوە لەپاش هەفتەیەك نوری هات بۆلام و دەستێکی لێ هەڵپێچابوو جلێکی خاوێنی لەبەردا بوو بوخچەکەی بۆ هێنابوومەوە، وتم نوری ئەم بوخچەیە بەرگی شین و شاییت بوو. با هەر بۆخۆت بێت!

### سەفەری جنوبم

شۆڕشی عەرەبی لەعیراق دەستی پێکردبوو، عیراق ئەیویست یەکەم ئەنجومەنی دامەزراندن (پەرلەمانی) پێك بێنێ، میرزا فەرەجی حاجی شەریف کرابوو بەئەندامی ئەنجومەنی تأسیسی پەرلەمانی عیراق لەساڵی ١٩٢٤دا، نایبە کوردەکان دەهاتنە ئەو خانە لەگەڵ میرزا فەرەجدا گفتوگۆو پەراوەی فەرمانی میری قانونیان دەگێڕایەوە، زۆرم بەلاوە سەیربوو کەئەو پیاوانە باسی شتێك دەکەن کەناوم نەبیستبوو پێیان دەووت (یاسا- دەستوور- سیستم). ڕۆژێك میرزا فەرەج و مەلا محەمەدی کۆیی- بەپرتاو خۆیان کرد بەژووری خانەکەدا، تومەز عەرەبەکان لە (صوب الکرخ)وە ڕاویان نابوون لەسەرئەوەی ڕێکەوتن لەگەڵ ئینگلیزدا بمێنێتەوە، لەبیرم ماوە کە ژنە عەرەبەکان هەل هەلەیان دەکێشا دەیانوت (تلاتمهر لاتمهر) هەڕەشەیان لەنایبەکانیان دەکرد بەوەی کەپەیمان لەگەڵ ئینگلیز تازە نەکەنەوە، هەر لەوکاتە شێواوو شپرزەیەدا لە (نەجەفەوە) خدری مامەم تەلگرافێکی نووسی بوو کەزۆر بەپەلە باوکم بچێت بۆ نەجەف، مەبەستی مامەم لەچوونی بۆ نەجەف تەنیا ئەوەبوو کەتوتن لەوێ باش دەفرۆشێ، مادام بازاڕی توتن واشکاوە توتنەکانمان بەرین بۆ شارانی جنوب، بەرەبەرە بەدوکانی جگەرەچیەتی و وردەفرۆشی ساغیان بکەینەوە ئەو ٢٤٠ فەردە توتنە بەمایەی (١٣) هەزار ڕوپیە کرابوو میرزا فەرەجیش (٣٢) هەزار ڕوپیە باجی بۆ دابوین.

ئەو توتنانە هەتا ئەو مێژووە بە (٤٥) هەزار ڕوپیە لەسەر ئێمە کەوتبوون، بەڵام ئەگەر بە جوملە بمانفرۆشتایە پارەی خەراوو موشەمایەکی قەپان نەدەکرد، چونکە بازاڕی توتن تاسنوورێکی زۆر ڕاوەستابوو بەسەدەها تجاریی توتن نابووت بووبوون (بەمعاملەی عشر بەعشرین و خمسة فوگانی) لەنەجەف دوکانی توتن چیەتیمان دانا لەناوەڕاستی بازارەکەی کەدەچێت بۆ (مەرقەد صحن)ی ئیمامی عەلی، بازاڕی توتن، توتنمان لەخەڵك بەهەرزانتر دەفرۆشت، ئەوەی

کەئێمەی زۆر نارەحەت کردبوو بەسەرهاتی مانگی موحەڕەم بوو، کەئەو شین و شەپورو لەخۆدان و خۆکوشتنەمان نەدیبوو شەوێک لەسەربانی خانێک لەنزیک دوکانەکەمان نوستبووین کەئەو خانە شێوە مەعبەدێکی ئایینی بوو، لەدرەنگی شەوا بوو بەهارەو گریان و چراخان، ئێمەش خەومان لێکەوتبوو، باوکم لەخەو ڕاپەڕی، وامان زانی بەهۆی کێشەی شیعەو سوننەوە پەلامارمان دەدەن باوکم لەسەربانەکە بەغار چووە خوارەوە، تومەس شەوقی لۆکس و چراخانەکە لەچاوی داوە، نەیزانیبوو کەچەند پلەیەک پلپلیکانەی ماوە بگاتە تەختایی، لەو هەوایەوە دەکەوێتە خوارەوەو قوڵێکی دەشکێ، جا هەر بەم شەوە کەوتینە پەلەقاژەی (جەراح) دۆزینەوە، مانگی موحەڕەممان پێوە نەهات، ئەمجا هەندێک توتنی ترمان لەبەغداوە هێناو چووین بۆ شاری (سواری)یە کەئێستا بەم شارە دەڵێن (فيصلية)، توتن لەوشارە باش دەفرۆشرا، چونکە لەو شارە (شێخ موحسین ئەبو تەبیخ) دۆستی باوکم بوو کە گەورەی ئەو شارە بوو. عەشایری دەوری ئەو شارە هەمووی جگەرەخۆرو توتن پربوون، بەڵام خەڵکی ناوشارەکە ڕقیان لێ هەڵئەستاین، لەبەر دوو شت یەکەمیان لەبەرئەوەی کەتووتنمان لەتووتن چیەکانی ئەو شارە بەهەرزانتر دەفرۆشت، دووەمیان ئەوان شیعە بوون و ئێمەش سونی مەزهەب-بووین کەئەم غەرەزە غەرەزێکی کۆن بوو لەنێوانی شیعەو سوننایەتی.

### ئەوان وتیان بیگرن کوردەو منیش ویستم کوردایەتی بکەم

دوکاندارەکانی سواریە ڕقیان لێمان هەستا، من فێری عەرەبی بووبووم لەقسەی خەڵکەکە دەگەیشتم گوێم لەمنداڵان بوو دەیانوت لەرۆژی (عيد الزهراء)دا کەرێکەوتی (٢٠)ی مانگی سەفەر دەکات ئەم (سونیانە) چەرمەسەرییەکی باش دەدرێن، ئەو قسانەم بۆ باوکم و مامەم دەگێڕایەوە پێم پێدەکەنین دەیانوت شتی وا چۆن دەبێ ئێرە حکومەتی لێیە، بەڵام من گوێم نەدایە پێکەنینی باوکم لەژێرەوە ئامادەسازی خۆم کردبوو، چەقۆیەکی (ئۆتۆماتیکی) وەکو خەنجەرم کڕیبوو لەژێر دشداشەکەما لەتەنگەی خۆم بەستبوو باوکم و مامەم بۆ مەسئەلەحەتی توتن فرۆشتن دوکانیان بەجیاوازی دانابوو مەودایەک لێک دووربوون ڕۆژی (٢٠) مانگی سەفەری ئەو ساڵە بوو بەقیامەت دوکان و بازاڕ داخرا لەشکری گەنج و منداڵ و پیرو ژن و خەڵکی عشایری دەورەی سواریە هەموویان بۆ ئەو جەژنە هاتبوونە ناوشار لەهەموو لایەکەوە خۆیان بەجۆرەها بۆیە ڕەنگاندبوو کڵاوی قوچ قوچی پڕ لەزرو زەنگیانەیان لەسەر نابوو، لەهەموو لایەکی شار بووبوو بەفریوو هەل هەلەکێشانی ژنان، منیش لەلای باوکمەوە دەچوومەوە بۆلای مامەم لەنێوانی دوکانی مام و باوکم چەند منداڵێک پەلاماریان دام، چەند (بوتاسیک) فیشەکە شێتەیەکیان بەسینگمەوە نا هاواریان کرد (لزمو کوردی) منیش هەر بەخەیاڵی (قەڵادزە) لام وابوو ئەگەر کەسێک غەدرم لێ بکا (وەلی خاڵم) لەگەڵ (حەمە عەلی) ژن برای مامەم کە لە ماڵی ئێمەدا بوون لەسەرم دەکەنەوە، بەپشتیوانی ئەوان سەرشۆڕیم لەمنداڵان قبوڵ نەدەکرد، ئاگری شەرم بۆ باوك و مامەم نایەوەو خۆم کوتایە ناو ئەو زەماوەندو هەرایە، پیرە چەقۆم هەڵکێشا یەکێکم لەمنداڵەکاندا بەعەردا خەریك بوو لەداخی بوتاسەکە سەری بڕم، چونکە بوتاسەکە لەسەر سنگم تەقی بوو، سنگی سوتاندبووم ئەمویست بەجەرگی کوردایەتی خۆم لەم وڵاتەدا دەربخەم، بەڵام هەر ئەوەندەم خۆش بوو کەمنداڵەکە زیراندی بەسەدەهایان پەلاماریاندام باوك و مامەی قوربەسەریشم بەهاواری منەوە هاتن، بەڵام ئەوەندەیان بەدارو تێلاوو بوکس و عگالە لێدابوون هەموو لەشیان تێك شکابوو، جلەکانیان لەبەردا هەموو ئەنجر ئەنجر کردبوون، ئەگەر پۆلیس و ئینزباتی شێخ موحسین، پێ ڕانەگەیشتبایە دەبووین بە قوربانی تازییەی ڕەوانی فاطمة الزهراي مانگی سەفەر, (حبيب) ناوێ وەکیلی شێخ موحسین کە لەوشارەدا زۆر بەنفوز بوو بەفریامان کەوت بەشەل و شەکەتی هەرسێکمانیان بردە بەردەمی دادگا، پیاوە ناسراوە سەبەبکارەکانیان کۆکردەوەو ڕەوانەی زیندان کران لەترسی هەڵمەتی ئێوارەش ئێمەیان بردبۆ ماڵی شێخ یوسف بۆ ڕۆژی دوایی لەژێر چاودێری پیاوانی شێخدا چووینە سەر ئیش و فەرمانی دوکانەکانمان، کەخەڵکەکە زانی لەلایەن شێخەوە ئێمە پارێزگاری ئەکرێین، ئەمجا نەیان ئەوێرا بەلاماندا بێن.

هەر ئەو ساڵە لەشاری (سواریە) چوومە مەکتەب لەپۆلی (٥)ی سەرەتایی وەرگیرام، میرزا فەرەج (١٠٠) فەردە توتنی بەجوملە بۆ فرۆشتین، بەڵام تەنیا پارەی دوو خانیاتەکەی خۆی پێ پڕکردبۆوە.

لەسەر شێوەی (عشر بەعشرین و فوگانی)ی (١٤٠) فەردەشمان بەم شێوەیە لەشارانی نەجەف، کەربەلا، تورج، کوفە، شنافیە، سراریە، جعارە، خەروم، حمیدیە، سەماوە، رومەیسە، حلە، دیوانیە، ناسریەو شەترە دوایی پێ (ب.ل) هێنا منیش پۆلی ٦ی سەرەتاییم لەگەڵ تەواوبوونی توتنەکاندا تەواوکرد، لە (١٣) هەزار ڕۆپیی دەست مایەمان تەنیا (٣) هەزار ڕۆپیمان بۆ مایەوە، بەڵام ئەگەر بەم پێیە توتنەکانمان نەفرۆشتایە نەمان ئەتوانی پارەی دوخانیاتەکەی میرزا فەرەج قەپان بکەین، ئەو (٣) هەزار ڕۆپییەمان دا بەچەرم و فاسون و فەحمەلۆ و ماهوت, کەئەمان زانی ئەو شتانە بەپارەی باش ئەفرۆشرێن هەتا ئێمە ئەو توتنانەمان ساغ کردەوە خەتی شەمەندەفەریش گەیشتبووە کەرکوك، خەبەرمان وەرگرت کە پیاوەکانی شێخ مەحمود ڕێگای سلێمانی و کۆیەیان گرتووە لەدەرەوەی ڕێگای (یاروەلی) نزیکی کەرکوك ڕاوو رووت ئەکەن, شتێك کەبەکەڵك بێ ئەیبەن, باوکم و مامم (١٢) حوشتریان بۆ من بەکرێ گرت چەرمەکانیان بۆ بارکردم بەرێگای یاروەلی و کۆیەدا منیان بەرێکرد.

خۆشیان کوتاڵەکانیان بەئۆتۆمبێل بارکردو هەردووکیان بەسواری ئۆتۆمبێل چون بۆ هەولێر، کە لەهەولێرەوە بەرێگای ئاسایشدا بچنەوە کۆیە منیش سواری حوشترێکی نێرەکی سپی بووم لەسەرباره چەرمێکەوە هەتا لەزابی بچوك پەڕینەوە تووشی هیچ موشکیلەیەك نەبووم، بەڵام لەخوار دێی تەق تەق حوشترەکەم کەوتە حامبازە ملێ، لەبەرەو ژوور کەیەکەدا کۆپان و بارە چەرم و من بەسەریەکدا هاتین، چونکە حوشترەکە تەنگی پێ هەڵچنرابوو هەر لەسەر دەستووری دەشتی عەرەبستان وێڵ کرابوو، بەسەر خڕەبەردێکی دەم زێدا کەوتم و قاچی ڕاستم لەجێ چوو بەکوێرەوەرییەکی زۆر گەیاندمیانە کۆیە لەوێ تەداوییەکی باش کرام.

لەدوای چەند ڕۆژێك ئەمجا چووینەوە بۆ قەڵادزێ، ئای دایکە هەژارەکەم ماوەی مەودای ئەو (٣) مانگە بەجێم هێشتووی، ئۆخەی دایە گیان؟!

### بابێمە سەردەمی دڵداریم!

لەساڵی ١٩٢٧دا لەنێوان هێزی دەوڵەتی ئێران و عەشیرەتی پشدەر لەسەر قڕەی دێهاتی (سوینایەتی) بوو بەشەڕ لەناوچەی سەردەشت، عەجەمەکان لەسەردەشت دەرکران پشدەرییەکان کوشتارو برینداریان زۆر بوو، لەدۆستەکانی باوکم حەمدی مەلا برایم ناوی خاوەنی دێی (بەرسول) بریندار کرابوو، باوکم بۆ ئەحواڵ پرسین و دڵخۆشی دانەوە بەدیارییەوە ناردمی بۆ دێیەکەیان کە (٣) سەعات لەقەڵادزەوە دوور بوو، ئەو پیاوە کچێکی هەبوو خونچەی ناو بوو هەر بەئەوەل چاوپێکەوتن تێك چووم، پەنجەی ئەو کچە هەموو ناودڵمی بریندار کردم و سامان و ئارامم باری کرد! چونکە ئەوەل دڵداری و حەز لێکردنیشم بوو بەبێ فڕوفێڵ و خورداری تەسلیم بووم، لەپێش چاوپێکەوتنی ئەو کچە زەوقێکی زۆر بەتینم لەگەڵ شیعردا نەبوو.

بەڵام ئەمجار بووم بەبوێژی دڵداری! لەگەڵ کچە چاوپێکەوتنی ڕاستەقینەمان پەیداکردو بەڵێن و پەیمانی دڵداری بەسترا ئاگری دڵداری تاوی سەندو دڵداری ئەو کچە بوو بەهۆی ئەوەی کە لەخوێندن پشتم ساردببێتەوە شەوو ڕۆژ وێنەی ئەو کچەم بەخەیاڵ ئەکێشاو بەشیعری تیندار ئەمڕازاندەوە! شێواوی ئەو شیعرانە بووم کەجوانی ئەوی پێ باس بکەم، دونیاشم هەربۆیە خۆشم ئەویست کەئەوی تیا دەژی، بەسەردا هاتنی باوك و دایك بێ سوود بوو، لەپێناوی چاوە کاڵەکانی ئەوا دارایی باوکمم دوایی پێهێنا، بەڵام دەردمان بێ دەرمان بوو، چونکە هەر بەمناڵی لەئامۆزایەکی خۆی مارەکرابوو، بەرێگایەکی شەرعی چارەمان بێ چارە بوو، کچەیاندا بەئامۆزایەکەی تەنیا من لەو دڵدارییەدا ئەوەم پێ برا کە لەهەوەڵ جار بووم بەشاعیری وێنەی شاکاری ئەو! فەننی شیعرم بەسەر باڵای ئەودا (تطبیق) کرد، سیمای ئەو نیگارە بۆ من بوو بەمامۆستای هەڵبەست و دڵداری.

بەڵام لەدوای شووکردنی مەودایەکی کەم ژیاو لەناو چووە دەرو مرد، بەڵام هەر بەلاشە لەجیهانا ون بوو ئەگینا داستانە جوانەکەی کەپێی ئەڵێن (بەهەشتی دڵداری) هەروا لەتازە کورەی هونەرو بڵاوکردنەوەدایە، تەرزی ژیانمان کەوتە کەم و کوڕی، لەبەهاری ١٩٣٠دا باوکم لەسەربانی خۆمان لەقەڵادزە کەوتە خوارەوەو وەفاتی کرد، ماینەوە من و دایکم، بەڵام خدر مەنگوری مامیشم هەر بەسەرشانی منەوە بوو، چونکە دووچاری نەخۆشی بەرمەنگ (ضيق التنفس) بوو بوو نەیدەتوانی بەهیچ وێنەیەك ئیش بکا، هەر لەوسەرو بەندەدا (سەلیم ئاغا) ئاغای قەڵادزە، قەڵادزەی هەڵوەشاند، ئەو هەموو خەڵکەی لەوشارە دەرکرد، لەمەترسی ئەوەی کەحکومەت ئەیەوێ بێتەوە قەڵادزە، ئەگەر قەڵادزە ئاوەدان نەبێ حکومەت نایەتەوە بۆ پشدەر.

### اغای ناوبراو خانووەکەمانی هەڵوەشاندەوە.

دانیشتوانی قەڵادزە هەریەکەیان ڕوویان کردە وڵاتێك، منیش لەگەڵ دایکم و مامەم و خێزان و منداڵەکانی کەبریتی بوون لەدوو کوڕی بچکۆلانەو ژنێك چووین بۆ (ڕانیە).

### ژیانی دوای قەڵادزێم و کاسبی بێهوودە

هیچ کاسپییەك نازانم، بەخێوکردنی دایکم و ماڵی مامەشم بەسەرشانی منەوەیە دایکم (ئاڵقەو گوارەو دەرزیلەیەکی) زێڕی هەبوو، لێم ساند، چووم لەناو مەنگوڕان فرۆشتمن بە (٣٥) لیرە، چونکە ئەمویست کاسبی بکەم و دایکم بەخێو بکەم، چاو لە ڕێوشوێنی باوکم بکەم کەپیشەی هەر تیجارەت و بازرگانی بووە، پارەکەم دایە (اعطاي) لەگەڵ مدحتی ڕەشید- ئەفەندی ناوی خەڵکی سلێمانیدا کە بەیەکەوە لەحوجرە خوێندبوومان و هاوەلی منداڵیم بوو، چووین بۆ ناو عەشیرەتی مەنگوڕ لەناوچەی خوار کوترەلو، دولەرەوییو تەنگی سیمان تەواوکرد، زۆربەی شتەکانمان بەڕۆن و موو دا، لەدوایین حیسابدا کە لێکم دایەوە مایەکەم زۆری کەمکردووەو قازانج سەری مایەی خواردووە، چونکە زۆربەی شتەکانمان لەلایەن ژنانەوە ئەدزران، ئەمجا لەگەڵ حەمەی خەلیفە قاسم ناوی هاوەڵمدا چووینە سەفەر لەدەوری ئەوییشا لەجیاتی قازانج زەرەر بەردەرگای پێ گرتمەوە، دەست مایەکەم هەروا ئەتوێتەوە، لەم کاسبی و هاتووچۆیەدا سەرکەوتوونیم، وازم لەکاسبی هێنا دەستم کرد بەئیشی سەرپێی، ڕۆژێك پیاوێك وتی (٣) ڕۆپیەت ئەدەمێ ئەو نووسراوەم بۆ بەرە بۆ (تەنگیسیمان)و وەڵامەکەم لای کاك مەحمودی پەنیر کر بۆ بێنەوە، تفەنگێکی وەلی خالم لابوو پێیان ئەووت (ماوزەر)، ٣ فیشەکی ساغی لەگەڵدا بوو فیشەك دانەکە پڕبوون لە (قاپورە فیشەك) پیرە کاغەزو سێ ڕوپیەکەم لێ وەرگرتوو تاوم دایە تفەنگە پڕ قاپوورەکەم، ڕووم کردە ناوچەی چەکوچ کەشاخێکی زۆر بەرزو چڕە، لەتاوی ئاو چاوم هەردی نەئەدی هەر کە لەشاخەکە سەرکەوتم کانی و ئاوێك هەبوو، لەرێوە خۆمدا بەکانیەکەدا، ئەوەندەم ئاو خواردەوە هەتا بێ هۆش

کەوتم، وەختێك خەبەرم بۆوە کەوا شەوە ئەستێرە بەهەمو لایەکی وڵاتدا ئەدرەوشێتەوە دوو زەلامم لەپشت سەر دانیشتبوون و تفەنگەکەمیان لای خۆیان داناوە، وتیان تۆ بۆچی وات لێهاتووەو لەکوێوە دێی؟ وتم بەخوا ئەوەل کاسبی و سەفەرمە کە بۆ دایکمی دەکەم، ئەوانیش وتیان ماڵەکانمان لەدیوی ئەودیودایە، وەرە بابڕۆین بۆ ماڵی ئێمە، ئەو شەوە لەوێ رامبواردو بەیانی کەوتمەڕێ، بۆ تەنگیسیمان وەڵامی نوسراون لەکاك مەحمود ناو وەرگرتەوە لەرێگای (خواری) لەلایەن پیاوەکانی سوارەی حەمەدی گوڵاوی ئاغای مەنگور گیرام و بردمیان بۆلای سوارئاغاو وتیان مەلا محەمەدی دیلویی لەپشدەر حیسابی ددانسازی لەکابرایەکی ددانساز دزیوە، بەتۆدا ناردویەتی بۆ ئەو ناوە، ئێستاش پێمان بڵێ لەلای کێت داناوە، چونکە مەلا دیلویی مامۆستای تۆ بووەو لەگەڵ ئەودا هاودەنگیتان گەرمە، ئەگەر شتەکان ئاشکرا نەکەیت زۆرت ئازار ئەدەین، منیش وەڵامی سورئاغا-م دایەوە کەئەو وێنە ئیشانە لەمن ناوەشێتەوە، من لەپێناوی نووسراوی کاك مەحمود ئاوا گەیشتومەتە ئێرەو ئاگاداری ئەو رووداوە نیم، من ئێستا ماڵم لەرانییە نەك پشدەر، خەریکی ئەوە بوون لێم بدەن، بەڵام سەید عەلی سەفاخانەیی کەلەوێ بوو فەریام کەوت و وتی من حەمەدئەمین ئەناسم ئەو شتانە لەم ناوەشێتەوە، بەزەمانەتی ئەو بەرەڵا کرام، وتم دایە من بۆ کاسبی نابم، ئەوە ئاکامی کاسپیەکانمە کەبۆتانی دەگێڕمەوە، ئەمجا لە (رانیە) بووم بەکاتبی قادر سوڵتان ناوێکی تاجیر، مانگی بە ١٥ رووپیە، هەر لەوسەرو بەندەدا گوڵچینی ئامۆژنم مرد، مامیشم بێ نەوا مایەوە.

خۆشی بەخۆی و منداڵەکانییەوە بەسەرشانی مندا هات، ئەمجا بووم بەمیرزای مامەند ئاغای سەرۆك عەشیرەتی ئاکۆ لەدێی سەرکەپکان، مانگی بەلیرەیەك و هەموو مەسرەفێك بەو مەرجەی ساڵی دوو سەپانی-توتنم بداتێ و شکارتەی برنجیشم بۆ بکات و وەکو کورەکانی خۆی تەماشام بکات، ماڵی خۆم و مامم بردە سەرکەپکان بۆلای ئاغای مامەند ئاغا لەوێ ناوی میرزایەتیم بەسەرابرا ناوم بوو بەمیرزا محەمەد ئەمین، ئەو ناوی میرزایەتیەم دەستکەوتی ئەو ئاغایە بوو کە وشەی میرزا لەناو عەشایەرو وڵاتی ئێراندا لەجیاتی ئەفەندیو سەیدو کاکە بەکاردێ، بەرهەمی ساڵانەشم لای مامەند ئاغا ئەوەبوو کەتوتنی ئەوەل ساڵم کوللە خواردی، برنجەکەشم لەبەر بێ ئاوی وشك بوو، تووتنی ساڵی دووەم بە (رحمین) ناوی جولەکەیەکی کۆیی فرۆشت لەپێش وەرگرتنی پارەکەم (جولەکەکە) لەبیتوێن کوژرا، پارەکان سەریان تیاچوو، برنجی ئەو ساڵەشم بەراز خواردی موقەدەراتی مانگانەکەشم ئەوەبوو مامەند ئاغا چوارسەد روپیەی مەعاشی هەبوو لای حکومەت هەموو مانگێك من دەچووم وەریبگرم، ئەو مانگەی کەقەرزداری (مالیات و بەردەرامەت و مەرانەو زەکاتی) حکومەت ببوایە تەنیا مەعاشەکەیان مەحسوب دەکردو ئیزنێکی قەبزیان ئەدەیە دەست من، مەعاشی ئەو مانگەی من ئەبوو بەهیچ زۆربەی مەعاشەکانی بۆ ئەو وێنە رسوماتانە حیجز ئەکراو موچەکانی منیش سەری تیا ئەچوو، لەبارەی خەرجکێشانی خواردەمەنی و شەکرو چاو پارەشەوە زۆر بەکەموکوری یارمەتی ئەدرام، ئەو خەرمانەی کە لەکاتی خۆیدا بۆی دیاریکردبووم وادەرنەچوو، هەر کەلوپەلێکی کەپێمان بوو لەماوەدای ئەو دووساڵەدا خواردمان، وەکو کورەکانی خزمەت نەکرام، مامەشم لەدێی سەرکەپکان وەفاتی کرد، خێزانم بوو بە (٤) کەس، جائەم چوارکەسە بەچی بژێنم؟ مەعاشی ئاغا ئەوا بەر مالیات و بەر دەرامەتی حکومەتی ئەکەوێ، زەخیرەو کەلوپەلی ژیانیشمان پێ ناگاو خواجە (رەحمین)یش کوژراوە، پارەی توتنەکانمان سەری تیاچووە، برنجەکەشمان بەراز خواردوویەتی لەسەر ئەو رووداوانە لەگەڵ ئاغا بەرێزم تێکچووین!

### ماوەیەك لەدەوری مووچەخۆری!

لەئەوەلی بەهاری (١٩٣٢)دا چووم بۆلای سوارئاغای حەمەد ئاغای سەرۆك عەشیرەتی پیران کە لەدێی (سەرخمە) دادەنیشت، داوام لێکرد نووسراوێکم بۆ بنوسێ بۆلای کاپتن لاین موفەتیشی ئیدارەی کەرکوك و هەولێر بۆئەوەی، بەڵکو وەزیفەیەکم بداتێ، سوار ئاغاش نووسراوێکی بۆ نووسیم و لەنوسراوەکەدا وتبووی میرزا محەمەد ئەمین پورزای من ئەبێ بەهەموو کارێك دایبمەزرێنن بەمووچەخۆر لەرانیە، نووسراوەکەم لەکەرکوك دا بەکاپتن لاین، ئەویش نووسراوێکی بۆ جەلال بابان- موتەسەریفی هەولێر بۆی نووسیم کەئەبێ بەرەسمی، یاخود نارەسمی لەرانیە دابمەزرێ، جەلال بابانیش لەسەر میلاکی (خدران) کردمی بەقۆڵچیی ئیستهلاك مانگی بە (٥٥) رووپیە، بەڵام قایمقامی رانیە کەناوی جەمیل ئاغا بوو خەڵکی کۆیە بوو خزم و کەسی رەش و رووتی خۆی زۆر بوو، پێی خۆش نەبوو کەمن ئەو مووچەیەم پێدراوە، لەپاش ماوەیەك بەنهێنی نووسیبووی کەئەم شەخسە لەگەڵ پشدەرییەکان پەیوەندی هەیە، لەبەرئەوەی تەشکیلاتی پشدەر نەکراوە من وا ئیقتراح دەکەم کە لەوەزیفە نەمێنێ. لەسەر ئەو تەقریرە لەوەزیفەی قۆڵچیەتی دەرکرام، بەڵام لەئیقتراحی دەرکرانەکەما نووسیبووی کە لەجێگەی من حەمەد ئاغا-ناوێك دابمەزرێنن، منیش بەپەلە پەل چووم بۆلای کاپتن لاین کە لەبەسەرهات ئاگاداری بکەم، بەڵکو ئەم بێویژدانییە قەبوڵ نەکات، کاپتن لاین چوو بوو بۆ لەندەن، چووم بۆلای جەلال بابان و تێمگەیاند کەجەمیل ئاغا لەم نووسینەدا تەنیا مەبەستی ئەوەبوو کەحەمەد ئاغای ئامۆزای بکات بەقۆڵچی لەجێگای من، جەلال بابانیش وتی راست ئەکەی بۆ حەمەد ئاغا ناوێکی نووسیوە، بەڵام من نەتۆ نەئەم لەم جێگایە دانامەزرێنم بەنسبەت تۆوە مەعقول نییە قسەی قایمقامێك بۆ تۆ بشکێنم کەقەزایەك بەرێوە دەباو حکومەت ئیشی پێی هەیەو مەعاشەکەی (١٠) ئەوەندەی مەعاشەکەی تۆیە، بەڵام تۆ بچۆرەوە چاوەروانبە بەڵێنت ئەدەمێ کەئەگەر ئیشێکی تر رێککەوت لەرانیە تۆ دادەمەزرێنم.

**ئینجا نۆرەی سەفەری کەرکوک!**

لەدەوڵەتی دونیا ئەسپێکم شك ئەبرد، ئەوکاتەی پێیان وتم لەوەزیفە دەرکراوی سواری ئەسپەکەم بووم چووم بۆ هەولێر لەلای سەعیدی کوڕی حەمەگوڵێی هەولێر میوان بووم کەهاوڕێی حوجرەم بوو لەقەڵادزێ، لەو ئەسپە پتر هەرچی پارە بێ پێم نەبوو، ڕۆژ بۆوە ئەسپەکەم دایە دەست سەعید کەهەتا لەکەرکوک ئەگەڕێمەوە بۆم بفرۆشێ، سەعید-یش تەنیا (١٠٠) فلسی پێبوو لێم وەرگرت دام بەهەقی ئۆتۆمبێلێکی لۆری و لەسەری سەرەوە لەسەربار سوار بووم، تەپوتۆزی دەشتی هەولێر هەموو گیانی پەکخستم، لەئاڵتون کۆپری لەچایخانەیەك لاماندا بۆ نان خواردن و ئیسراحەت کردن، منیش لەبەرئەوەی کەهیچم پێ نەبوو چووم لەودیوی چایخانەکە لەسوچێك لەبن دیواری چایخانەکە دانیشتم بیرم لەبەدبەختی و چارەڕەشی خۆم دەکردەوە لەبرسانیشدا نەمدەزانی چیبکەم؟ ئەوەندەم زانی شاگردی چایخانەکە چایەکی بۆهێنام، منیش وتم: پارەم پێ نییە ناخۆم، شاگردی نامەرد بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد کە (بو کوپك ئۆغلی دێدی پارەمز یو قدر) بەمانا ئەو سەگبابە ئەڵێ پارەم نییە چا ناخۆمەوە.

چایچییەکەش وتی (گێت) بەمانای (بهێنە)! بەم ڕووداوە زۆر تەریق بوومەوە، بەڵام تەریق بوونەوە بۆ پیاوی بێ پارە جێی چی دەگرێ؟ سواری ئۆتۆمبێل بووین و گەیشتینە کەرکوك، نەختێ خۆم تەکاندو یەکسەر چووم بۆلای کاپتن لاین کەوەکو لەمەوپێش وتم چوو بوو بۆ لەندەن، ئەمجا پتر مەعنەویاتم شکا، چونکە هەرچی هیواو ئومێدێکم هەبوو داپۆشرا! ئەمجا کەوتمە سەر بیرکردنەوەی ژیانی ئەمشەوم و گەڕانەوەی بەیانیم بۆ هەولێر، بەبیرما هات کەخوشکێکی (مەلا دیلۆیی) مامۆستام ناوی (زێڕینە)و لەکەرکوك مێردی بەقاچاغچییەك کردووە کەناوی سەعید بێزارە-بدۆزمەوە؟ لەزۆر تووتن چیم پرسی کەس نەیدەناسی، ئەمجا بۆی پەڕیمەوە بۆ بەری قەڵات، لەوێش پرسیارەکانم بێ سوودبوو، لەئاخری بێزاربوونمدا منداڵێك وتی:ماڵیان نزیك بەتەکیەیە لەگەڵما هات هەتا بردمیە ماڵی زێڕین، هەر کەزێڕین لەدەرگا هاتە دەرەوە ناسیمەوە، باوەشی پیاکردم و بردمی بۆ ژوورەوە، خێرا نانی بۆ پێگەیاندم و کەوتمە ئارامی ژیان و بەسەرهاتەکەی خۆمم بۆ گێڕایەوە.

ئەو شەوە لەماڵی ئەوان بووم، بەیانی (٦) ڕوپیەی دامێ بۆ خەرجی ڕێگاو حەقی ئۆتۆمبێل و گەڕانەوەم بۆ هەولێر کە لەئاڵتون کۆپری پەڕینەوە تەماشام کرد ئەسپەکەم لەژێر بارەداری خانوودایە، زانیم کەسەعید هەر دوێنێ بۆی فرۆشتووم سەعید ئەسپەکەی دابوو بە (٣٩) ڕووپیە، بەنابەدڵی گەڕامەوە بۆ ڕانیەو چوومەوە بۆ پشدەر بەسەرهاتی خۆم بۆ بابەکر ئاغاو عەباس ئاغای سەرۆك عەشیرەتی پشدەر گێڕایەوە کە لەپێناوی ئەماندا ئەو دارەیان پیاکێشاوم!

**لەحزبی (خوێنڕێژی)یەوە بۆ حزبی (برایەتی)!**

ئاغایانی پشدەری سەرەوە نووسراویان بۆ نووسیم بۆ ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی موتەسەریفی سلێمانی کە بمنێرێ بۆ مەدرەسەی مفوەزینی پۆلیس لەبەغدا بەناوی ئاغایەتی پشدەرەوە، چونکە لەوکاتەدا ئەفرادی عەشایەر لەو مەدرەسەیەدا وەردەگیران، بەڵام هەتا من گەیشتمە سلێمانی ئەو بەزم و باوە گۆڕابوو، لەپۆلیسی دەرەجەدار ئەو دەورەیە پڕ دەکرایەوە، ئەحمەد بەگی موتەسەریف و جەمیل ڕەشیدی مدیری پۆلیس بەڵێنیان دامێ کە (٣) مانگ پۆلیسی بکەم و دەرەجەم بدەنێ و بمنێرن بۆ مەدرەسەی موفەوەزین، باری ناچاری سەری پێ دانواندم بۆ وەزیفەی پۆلیسی لە ١٩٣٢/٤/٢٣دا سێ مانگم تەواوکرد.

نەدەرەجە دیاربوو نەدەورەی موفەوەزین لەجیاتی مەدرەسەی موفەوەزین داخلی دەورەی موخابەرەی هەلیو گراف مورس-یان کردم. (٣) مانگ ئەو دەورەیەم تەواوکرد. بەسیفەتی موخابەرەچی هەر لەوساڵەدا ناردیانم بۆ پاسگای گڵەزەردەو لەوێشەوە بۆ ماوەت، لەماوەتەوە موزەکەرەیەکی بەدرەفتاری فەرمانبەرانی لیوای سلێمانیم دا بەمەلیك غازی مەلیکی عێراق دەزگای پۆلیس لەسەر ئەوە هێنایانمەوە بۆ سلێمانی لە ١٩٣٤دا مەلیك غازی هاتە سلێمانی چووم لە باشگای ئەفسەران خوتبەیەکم بەشیعر خوێندەوەو لەسەرئەوە خەتێکیان دامێ، بەڵام لەپاش گەڕانەوەی مەلیك غازی (٧) ڕۆژ زیندانی بێ موزەکەرەیان کردم، مەبەستیان ترساندنم بوو نەك زیندانی کردن، بەڵێنیان لێ ساندم کەجارێکی تر ئەم وێنە جەسارەتانە نەکەم ڕۆژ بەڕۆژ سیمام لەبەرچاوی دائیرەی پۆلیس و میری ناشیرین ئەبوو، چونکە دەیانزانی ئەو جوڵانەوەیەم جوڵانەوەی پۆلیسێك نییە کەمووچەخۆری بەلاوە مەبەست بێ لەبەرگی پۆلیسدا, کەچاوم کردەوە زانیم ئەگەر ئەو پۆلیسە چەکدارانە لەبارێکی کوردایەتی و زانایەتی بیاندرێنێ و بیانخاتە ناو بیرێکی حزبییەوە، ئەوا دەتوانێ هێزی حکومەتی لەلیوای سلێمانی سڕ بکەن, لەگەڵ چەند پۆلیسێکی باوەڕپێکراو ئەو فکرەیەم درکاند ئەوانیش موافیق بوون بۆئەوەی کەحزبێك بەناوی حزبی (خوێن ڕێژی) پێك بێنین، دەستمان کرد بەحزب دامەزراندن و پۆلیس بانگ کردن بۆ ئەو بیروباوەڕە، لیژنەیەکمان بە (١٢) ئەندام لەپۆلیسی بەرجەستەو زانا هەڵبژارد بۆ هەڵسوڕاندنی فەرمانی حزبی (خوێن ڕێژی) حزبەکەمان کەوتە گەشەو پێشکەوتنی ڕۆحی کوردایەتی و نیشتمان پەرستی لەناو پۆلیسا بڵاوبۆوە.

پەیڕەوو ئامانجیشی ڕزگاری و ئیستقلالی کوردستان بوو، لە (١٩٣٥)دا مەلا (حەسەنی قازی) کەموڵەقەب بوو بە (شاهۆ) هاتە سلێمانی بەهۆی چەند برادەرێکەوە لەگەڵ ئەو پەیوەندیمان پەیداکردو هاتە ناو حزبەکەمانەوە، ئەمجا لەپاش لێکۆڵینەوەیەکی چەند ڕۆژی ناومان لەحزبی خوێنڕێژی ناحزبی برایەتی، چونکە لەوکاتەدا برایەتیمان لەخوێن ڕێژی بەلاوە پەسەندتر بوو، هەمو کۆبوونەوەیەك بەهەڵبژاردن سەرۆکمان تەعین دەکرد هەتا

کۆبوونەوەیەکی تر ئەو لیژنەیە مەسئول دەبوو لەراپەڕاندنی فەرمان، لەو حزبە تازەیەدا کرام بەئەندامی لیژنەی مەرکەزی، هەر پۆلیسێك کەدارای نیشتمان پەروەری و ناوبانگی شەرافەتمەندی هەبوو خستمنە ناو ئەو حزبەوە.

تاق تاق پۆلیس مابوو کەسوێندو تەلاقی نەدەم و نەیخەمە ژێر پەیوەندی و تەحقیقەوە، پۆلیسی قەزاو ناحیەو مەخفەرەکەمان چین چین دەهاتنە سلێمانی بۆ ئیرشادو پەیوەندی پێوەکردن، ئەو حزبە گەورە بوو بوو بەخاوەنی چەکدارو پۆلیس، لقی بۆ هەموو لایەك هاویشت و لەسەرئەوە مەلا حەسەن-یان گوێزایەوە بۆ بەغدا، سەرپەرشتی حزبی برایەتی کەوتە دەست من، سەرکردایەتییەکی پۆلیسی حزبیمان لە: باش چاوەش حسێن ئەسعەدی زەنگەنە, بابە شێخ قەرەداغی، محەمەد جەبار جەباری، کەریم قادر، رەمزی قادر کۆیی، نادر قادر کۆیی و زۆر دەرەجەداری تر پێکهێنا کەئەوانە لەهەموو کاتێکا فەرمانی سەربازی حزب بەرێوەبەرن.

**(هەنگاوێك بۆ سەرکەوتن)... ئەو کتێبەی لەوەزیفەی وەدەرهێنام!**

هەر لەو سەروبەندەدا کتێبێکم بەناوی (هەنگاوێك بۆ سەرکەوتن) دانا، بەبۆنەی ئەو کارەوە بەهەلیان زانی لەلایەن حکومەتی ئەو حەلەی سلێمانی، مەجید یەعقوبی موتەسەریف و سەید عەلی حیجازی مودیری پۆلیس و عەبدولعەزیز خلوسی. ی. حاکم بریاریان لەسەر گرتنم دا، لەسەر ئەو کتێبە (٣١) جەلسەی مەحکەمەیان پێ گرتم.

ئەو رۆژەو وێنە توهمەتێکی خارجی چوارچێوەی کتێبەکەیان ئاراستە دەکردم ئیبراهیم ئەحمەد-یان بۆ گرتبووم بەپارێزەر، بەلام نەیان دەهێشت چاوی پێم بکەوێ، وەبێ حازربوونی ئەو مەحکەمە دەکرام!

لەئاکاما بەناوی پروپاگەندەی زیانبەخشەوە(مضرة) بەپێی مادە (٩٢) (ا) شەش مانگ حوکمی زیندانی درام، لەگەڵ سالێك چاودێری پۆلیس و دەرکرانم لەوەزیفەی پۆلیسی و موسادەرەی (١٥٠٠) نوسخەی کتێبەکەم.

لەوکاتەدا کەمنیان زیندانی کرد، ئەو چەتانەی کە لە حدودی عیراق خراپەیان لەگەڵ حکومەتی ئێرانا دەکرد بەفروفێڵی عیراق هەموویان ئیغفال کرابوون و خۆیان هاویشتە بەردەستی موتەسەریف مەجید یەعقوبی کەخەڵکی کەرکوك بوو، ئەویش هەموویانی خستە زیندان و کردنییە هاورێی من لەزینداندا، هەر لەو سەروبەندەشدا عەلی ئاغای پشدەری کەپەناهێندەی حەمە رەشید خان بوو ئەویش گیراو هاویشتیانە ژوورەکەی من، بەلام ناخۆشییەکی زۆر بەتین لەنێوان ناوبراوان: حەمە رەشید خان، سەید عەتا، مەجید گولباخی، حسە تاقە، سەید رەشید سەرزەلی هەورامان، عەلی ئاغاو حەمە لوقەدا هەبوو، لەزیندانا ئەوانەم بەیەکەوە ئاشت کردەوەو بریارماندا هەر کاتێ لەشەودا هەلمان بۆ هەڵکەوت پەلاماری پۆلیسەکان بدەین و بۆی دەربچین و لەمەرز (سنوور) شۆرشێکی گەورە بنێینەوە، لەپێش جێبەجێکردنی پرۆگرامەکە بەدوو رۆژ منیان بۆ کەرکوك بەرێکرد، لەوێ خستمیانە ناو زیندانی ئیشکەران لەخانووی موتەسەریفی کەرکوکدا هەموو رۆژێ بەقەمچی لێدان زیخ و چەویان پێدا دەکێشام!

بەلام ئەو ئاغایانەی سەرەوە فرسەت دەهێنن و نوبەتچی پۆلیس ئەگرن و چەکی (١٢) پۆلیس دەبەن و (٤٢) زیندانی مەوقوف و مەحکوم بۆی دەردەچن و تەنها مەجید گلباخی دەگیرێتەوە، چونکە رێگای لێ تێك چووبوو.

مەجید گلباخی-یان بەحەپسی هێنایە کەرکوك، دەیانویست بیدەنەوە بەئێران بۆ ئیعدام کردنی، بەلام من کە لەزیندان دەرچووم لەگەڵ برادەران پیلانێکمان رێکخست کەبیهێنینەوە بۆ سلێمانی.

چونکە دەعوایەکی رووتکردنەوەمان بەناوی برادەرێکی لەسەر قەید کردبوو، لەهەمان کاتیشدا هێنایانەوە سلێمانی بەکەفالەتی مەلا جەلال حەیدەری بەرەلامان کرد، بەلام شێخ لەتیفی حەفید زادە هانی دابوو کەفیرار بکات ئەگینا ئەیگرنەوە! ئەوەبوو مەجید گلباخی فیراری کردبوو خۆی تەسلیم بەحکومەتی ئێران کردبوو لەسەر بەڵێن و شەرەف و هەندێ فەرمانی دەسەلاتداری، کەچی لەهەمانکاتدا لەقەلای مەریوان رەمی دەکەن و دەیکوژن.

جا لەوکاتەی کە من زیندانی بووم، لیژنەی مەرکەزی و قیادەی چەکدار بریاردەدەن کەشێخ لەتیفی حەفید زادە بکەن بەسەرۆکی حزبەکە، چونکە ئەو حزبە بەبێ کەسێکی دەسەلاتداری وەکو شێخان، بەرێوەناچێ، کە لەزیندان بەربووم بەحوکمی حزبیەتەوە منیش چوومە ناو کۆری شێخ لەتیف و لەگەڵ شێخانا کەوتینە ئیش کردن، ئەو حزبە لەزەمانی شێخانا چەند فەعالیەتێکی کردو مرد، کردەوەکانی بریتی بوون لەتفەنگ پێوەنانی مەجید یەعقوبی-موتەسەریفی سلێمانی و بۆمبا خستنە مالی سەید عەلی حیجازی-مودیری شورتەوەو دارکاریکردنی عەبدولعەزیز خلوسی حاکم، پالەوانانی ئەم ئیشانەش بریتی بوون لەهەڤالان عارف قەرەچەتانی، محێدین مەرگەیی و عەلی محەمەد کانی دڕکەیی و حارس عەبدوللا کەئەمانە هەموویان پۆلیس بوون، لەو پۆلیسانە کە من سوێندو تەلاقم دابوون.

لەسەر ئەو رووداوانە من گیرام و خرامەوە زیندان، بەو بەلگەیەی کەبۆچی هەتا من لەزیندان دەرنەچووم ئەم ئیشانە نەکراون؟! بەلام لەبەرئەوەی کەهیچ بەلگەیەکی تونیان بەدەستەوە نەبوو هێزی موتەسەریف و مدیری پۆلیسی کۆن نرخی نەمابوو. حاجی رەمەزان پاشا کرابوو بەموتەسەریفی سلێمانی. عەلی غالب بەمودیری پۆلیس و مەلا سدیقی کۆییش بەحاکم، ئەوانەش بۆیە هاتبوونە سلێمانی کەئارامی بخەنەوە ناو ئیدارەی شارەکەوە، ئەوانە منیان بەرەلا کرد.

**ئەمجارە باری ناچاری خستمیەوە ناو حزب و لەگەڵ شێخانا شانبەشان کەوتمەوە تێکۆشان**

هەرچەندە کەدەشمزانی هەرشتێ کەپەنجەی شێخ و ئاغاو (متنفزین)ی تێبکەوێ دەروخێ! چونکە بەرژەوەندی دەوڵەتداری لەگەڵ بەرژەوەندی چینی هەژار لەیەك دەدەن و ئاکامەکەی لەسەر شێوای پتر ناگاتە هیچ سوودێك، بەلام باری ناچاری ئیعتراف

پێکردبووم کە لەگەڵ ئەم تاقمەدا ئیشبکەم، لیژنەی مەرکەزی کۆن گۆڕابوو بەم ناوانەی خوارەوە، شێخ لەتیفی حەفید زادە، دکتۆر نوری فتوحی، ئیسماعیل شاوەیس، سدیق شاوەیس، شێخ لەتیفی دانساز، حەمەئاغای خولەی بلە، مەنگوری و حەمە ئاغای عەبدولڕەحمان ئاغا.

حەمە ئاغای ئەوڕەحمان منی هێنابووە ناو ئەو حزبەوە، بۆئەوەی کەدژێك بەرامبەر بەشێخ لەتیف هەبێ، هەموو وەختێك نەتوانێ تەسەروف بەم حزبەوە بکات بۆ بەرژەوەندی فەردی خۆی، جا زۆربەی کۆبوونەوەکانمان بەگفتوگۆو قرەی فەرمانی حزبی دوایی دەهێنا، نەدەگەیشتینە ئەو ئاقارەی کەبۆ حزبەکە هۆی پێشکەوتن بێ، ئەو حزبە سەرۆکی نەبوو، چونکە کەسمان باوەڕمان بەکەسمان نەبوو، هەموو کۆبونەوەیەك (قرعە)مان دەکێشا، سەرۆکایەتی بەناوی کێ دەرچووبایە هەتا کۆبوونەوەی دووەم، واتا سەرۆکمان بەقورعەی (تورەکە) دروستدەکرد!

**ئاوارەیی بارزانییەکان**

لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٣٧-دا مەلا مستەفای بارزانی و شێخ ئەحمەدو شێخ سدیق و شێخ بابۆ، بە (٨٤) نەفەری ماڵ و منداڵەوە گەیشتنە سلێمانی. لەوکاتەدا حزبی برایەتی زۆر بەهێز بوو، منیش لەنیسانی ئەو ساڵەدا لەبەغدا عەمەلیاتی گوێچکەم کرابوو، بەڵام هەتا ئەو مێژووە برینەکەی پڕ نەدەبووەو وەزیفەی موخابەریەتیم پێ نەدەبینرا، چونکە نەمدەتوانی لەبەر هەتاو بووەستم.

پۆلیسێکیان دەویست کەشارەزابێ بینێرن بۆلای مەلا مستەفاو هەموو ڕۆژ جارێك ڕاپۆرت بدا کەبارزانییەکان هەموویان لەشاری سلێمانیدا مەوجودن، من خۆم تەرشیح کرد بۆ ئەم فەرمانە، چونکە مەبەستی گەورەشم ئەوەبوو کەبەراوردی قابیلیەتی مەلا مستەفا بکەم ئەگەر پێی بکرێ سەرپەرشتی حزبەکەمان بکات و بیکەین بەسەرۆکی حزبی برایەتی، فیعلەن منیان نارد بۆلای مەلا مستەفا، لەماوەدای (٢٠) ڕۆژدا لەهەموو بارێکەوە مەلا مستەفام دەدواند هەتا پێموت من لەسەر باوەڕی حزبێك قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم و ئەگەر تۆ بتەوێ سەرپەرشتی حزبەکەمان بکەیت ئێمە ئامادەین بتکەین بەسەرۆك، ئەگەر نەشتەوێ بچیتەوە بۆ بارزان ئێمە دەتوانین دەربازت بکەین هەتا من خۆم ئامادەم کە لەگەڵتا بێم، بەڵام مەلا مستەفا بەلای سیاسەت و حزب و شۆڕش و هەڵگەڕانەوە لەحکومەت نەدەچوو، ناڕەزاییەکی زۆری لەدەست عەشایەرەکانی کورد دەردەبڕی، ژیانی بارزانییەکان زۆر کوێرەوەری بوو، شێخ ئەحمەد (١٨) دینار، مەلا مستەفا (١٢) دینار، شێخ سدیق (٨) دینار شێخ (بابو) (٨) دینار کەئەو موچەیەش بەشی هیچی نەدەکردن، من لەو ماوەیەدا توانیم گوێدرێژ بۆ هەندێ لەپیاوەکانیان بکرم و لەلای ڕەشید ئەفەندی و فوئاد بەمەبەستی ئەندازیاری دائیرەی ئەشغالی سلێمانی بۆیانی قەید بکەم بەرۆژانەیەکی باش کەچەویان پێ بکێشن. بەتایبەتی دوو پیاوی مەلا (مستەفا) شەریف و حەکیم سوودێکی چاکیان لەئیشەکە چنگ دەکەوت، جا کەزانیم ئیستیفادەی شۆڕش و حزبگەری لەمەلا مستەفا ناکرێ ڕاپۆرتێکی دوورو درێژم لەهەموو بارەیەکەوە بۆ حزب نووسی تێیدا مەعزەرەتی مەلا مستەفاو کەنارگیری لەسیاسەتم تیا نووسی و خۆشم بارزانییەکانم بەجێهێشتن و چومەوە سەر ئیشەکەی خۆم، مەلا مستەفا بەسادەیی لەسلێمانی ڕایدەبواردو دەستی دایە خوێندنی مەلایانە لەخانەقای مەولانا لای مەلا عەبدوڵڵا چورستانی لەسەر شەقام هەتا ساڵی (١٩٤٢) کە لەسلێمانییەوە بەفیراری چووە ئێران و ماڵ و منداڵەکەی لەسلێمانی بەجێهێشت. ئەمجا حزبی برایەتی لە (١٩٣٨) بەولاوە دەستی کرد بەلێکترازان و تفەنگ پێکەوەنان و ڕاو ڕووتی ناوشارو لەخەڵك دان و شت کۆکردنەوە، منیش بەرهەڵستی ئەو ڕووداوانەم دەکردو هەمیشە لەگەڵ شێخ لەتیف و شێخ جەلالی حەفید وتووێژی توندوتیژم بەکاردەهێنا، شێخ لەتیف ئینزاری بۆ دەرکردم کەواز لەتەداخولی حزبەکە بێنم و هەم لەسلێمانیش نەمێنم، تێگەیشتم ئەو ئینزارە لەسەر ئارەزووی چەند کەسێکی ناتەواوی خاوەن هەڵسوکەوتی بەرەڵڵا دەرهێنراوە نەك شەخسی شێخ لەتیف، بەڵام بەرامبەر بەم ئینزارو هەڕەشەیە خۆم بەدڵشکاو دەزانی. بۆیە چووم بۆ بەغدا کردیانم بەفەرمانبەری شارەوانی چوارتا، بەڵام دەستەی بەدکاران لەوێش لێم نەدەگەڕان لەوە دەترسان کەحزبەکەیان لێ هەڵگێڕمەوە، نەیان دەزانی کە لەفەلسەفەی حزبەکە گەیشتووم کەهەتا ئەو تاقمە لەناو حزبەکەدا جێیان هەبێ نەمن و نەشێخ لەتیف سودێك لەو حزبە نابینین.

**شێخ مەحمودو داری کەلی**

لەساڵی ١٩٤١-دا کە ڕەشید عالی لەحکومەتی عێراق هەڵگەڕایەوە وەسی و نوری سەعید-ی لەعێراق دەرکردو ئینگلیزیش بەرامبەر بەرەشید عالی ڕاوەستا، شێخ مەحمود لەو هەلەدا لەبەغدا فیراری کردو هاتەوە بۆ شاربازێڕو دەستیدایە خەڵك کۆکردنەوە بەناوی شۆڕشی کوردو ماف وەرگرتنەوە دێی (سیتەکی) کرد بەجێنشینی ئوردوەکەی، لەهەموو لایەکەوە عەشایەرەکان هەریەکەیان بۆ مەبەستێك لەشێخ مەحمود کۆبوونەوە، لەپێش هەموو شتێکا دەستەی حاجی عەباس ئاغای دولی و هەمزەو ڕەشیدی عەولا ئاغای سورە قەڵات و ئەو ئاغایانەی کە لەلایەن دانیشتووی دێهاتەکان دەرکرابوون، هەلیان لێ ڕوون بووە پەلاماری دێی (وەران)و (گردە زبیر)یاندا لەگەڵ کوێخا ڕەسوڵ و کوێخا مەجید بەشەڕ هاتن و چەند ئاغایەکیان لێ کوژرا لەگەڵ کوێخا ڕەسوڵ ناوی گردە زبێریدا، حکومەت شێخ (مستەفا قەرەداغی) کرد بەموتەسەریفی سلێمانی و پیلانەکەی شێخ مەحمودی تارو مار کرد. ئەمجا حزبی برایەتی ئەوەی کەمابووشەوە لەژێر نیزامی حزبی هاتنە دەرەوە، حزبەکە لەسەر ئەو شێوەو ڕیزە دەرهات ئەمجا-ڕەفیق حیلمی-هەر بەم ناوەوە لەخەڵکی سلێمانی حزبی برایەتی دامەزراندو خۆی بەدامەزرێنەری حزبی برایەتی ناونا کەڕووداوو مێژووی ژیانی ئەو حزبەش ئەوەبوو کەپێشکەشم کردن.

ڕەفیق حیلمی لەدوا پلەی مردنی حزبی برایەتیدا بەم حزبە ڕاگەیشت، لەسەر دروشمی ئەو حزبە حزبی (هیوا)ی دامەزراند، ئەم حزبی هیوایە تاك تاك لەوکەسانەی تێکەوتبوو کە لەحزبی پێشوودا ئیشیان دەکرد، ئابەم شێوەیە لەسەر هێڵی حزبی برایەتی حزبی (هیوا) پێکهات.

# بەشێك لە شیعرەكانی میرزا مەنگوڕی

## ئەی وەطەن ١٩٣٥

(٤)

ئەی وەتەن داخ داری تۆمو دڵ غەمی لێ نارەوێ

بیر لەكرداری برایانی ئەكاتو ناخەوێ

چەند ئەكا ئالآی چەقاوی دوژمنی بۆ ناكەوێ

زۆر بەدیلی خاكەكەی پەستە بەلام ڕێك ناكەوێ

دەستی ئازادی جیهان بگرێ لەگەڵیا پێشكەوێ

* * *

ئەی وەتەن تا كەی تەماشای وێنەی هەردمان ئەكەی

كەی نیگاهی ڕێكوپێكی چارەی دەردمان ئەكەی

كەی پەراوەی هەستو ڕەنگو شێوەی زەردمان ئەكەی

كەی لەگەڵ گێتی بەیەك دەنگ فێری خوی مەردمان ئەكەی

كەی لەڕێی (هەورازی) ئازاد ڕێ ئەدەی كورد سەركەوێ

* * *

ئەی وەتەن گوێ هەڵخە سەیری كۆمەڵی بێگانە چۆن

خوینی كورد وەك شیری دایكیان بەسەربەستی ئەخۆن

ڕسقو روزیان پی نەهیشتین دەست بە خوێناومان ئەشۆن

هەر كەسە بۆخۆی بەلایی كورد ئەدۆشی جا ئەڕون

ئەو شتە بۆ كورد بەجێ دێڵن كەزۆردار پێ نەوێ

* * *

دوانزە مانگ كورد ڕەنج ئەدا نانی بەڕو گاڵی نیە

خاوەنی توتنە كەچی خێزانی دەسماڵی نیە

هەرچی كورد پەیدای ئەكا چونكە لەخوی والی نیە

خوێن مژی بێگانە بۆی خواردوە ئەویش حاڵی نیە

گەر لەبەر بێگانە چیتر ئەم بەشی بەر ناكەوێ

* * *

ئەی وەتەن لاوانی كورد سەربەستیی جاران یان نیە

هەرزەكاران یان دڵی دڵداری یارانیان نیە

هێزی هەڵپەركێو نیگێی جوانی بەهارانیان نیە

ڕەشبەڵەك باوی نەماوە ڕێی نزارانیان نیە

كچ وەكو جاران بەسەربەستی وەدوی كوڕ ناكەوێ

* * *

ئەی وەتەن بەیبونو نەسرینو هەڵاڵەو خونچە گوڵ

چونەتە ژێر باڵی نەرگز دەستیان خستۆتە مل

بای شەماڵ لێیان ئەدا لار ئەبنەوە زۆر نابەدڵ

كانیەكانی ناو قەدی یالآن وەكو جاران بەكوڵ

دەنگیان دەرنایێ ناوێرن كەڕویان دەركەوێ

* * *

ئەی وەتەن ئیشمان پەشێوە زوكە فریامان كەوە

كورد لەناو گێتی بەجێماوە دەزو ووریای كەوە

با لەگەڵ كاروانی ئازادیی كەوێ تەنیا ئەوە

هەروەكو فتبوڵ بەشەق بێگانەوە ئەخولێتەوە

تا قەڵای كۆنەپەرستی تێك نەدەی كورد ناسرەوێ

## پێچەوانەی گەردون ١٩٣٧

(٧)

بازاری هونەر ئەمڕۆ لەهەرلاوە شكستە

پەروانە وەكو من لەژیان دڵگیرو پەستە

خونچەو گوڵو چیمەن بێ نەشەو زینەتو هەستە

بولبول وەكو قومری لەسەروی سەروەوە مەستە

لەم داخو جەفایەی كەجیهان كۆنەپەرستە

زانا بە جەفا ئەمرێو (پەتیارە) بەدەستە

* * *

ئەم چەرخی بەدە قەت نەبو ساتێ بەمرادی
ژیرانی بجولێنتەوە دەرخا گوڵی شادی
هەڵ بگرێ لەناوا ڕەگی ناپاك‌و فەسادی
ڕیزی هونەرو مەردی بشێوێنێ لەعادی
ئەو پیاوە بەهەردا بەرێ گەر پیسە نهادی
تۆوی بەدو بەدخانە نەهێڵێ لە ئیجادی

* * *

تۆ سەیری سەرنج بگرە لەم چەرخە گەرۆکە
لە ڕوژی دەبابەو تۆپ‌و ئاتوم‌و فرۆکە
کۆیانی لە (ئەسپ) کردوە زینیش لە (کەروکە)
کزنی بەپڵنگ داوە بەگا گۆشتی (مەڕوکە
توخوا ئەمە ئیشە ئەوە کەی (دەست‌و چەپۆکە
وجدان‌و زەمیر بخرێتە چنگ (دیوو) جنۆکە

* * *

خوایی کە ئەمەی کردوە وهێی کردوە کە وابێ
کەر سوار بێ (وەبار کەر بێ) لەژێر قەمچی جەفا بێ
باوەڕ مەکە خوا قەت بەمە دڵ شادو ڕەزا بێ
گەر بێ تو (بەهەشتیش) وەکو ئەم ڕۆژە وابێ
بەم پێیە ئەویش کومەگی پشت دارو سزا بێ
ناچم بو بەهەشت (دەرزەنێ حوریم) بەتەما بێ

هەروەکو ئاگات لەدارشتنم نەبوبێ ئەی خودا
ئەو حەلەی گیانت بەبێ پرسین بەسەر خەڵکا ئەدا
خوایەکەم گەر تۆ منت کردوە لەناو ئەم کەونەدا
کوا جل‌و نان‌و ژیانم کێ ئەمانەم پێ ئەدا
تۆ کە نەتکردوم نیشانم دە ئەوەی ڕۆژیم ئەدا
تا هەڵیپێچم بڵێم خوا بتگرێ کۆلکە خودا
گەر خوداوەند پێی نەگوتبوی چیت لەسازی ئێمەدا
وا مُنت سەرگەردو بەدبەخت کردوە لەم ڕوژەدا
بۆ بە قاچاغی منت خستۆتە ناو خەڵکی خودا

### وەلامی خوا

مەنگوڕی من تۆم نەکردوە نیمە لەم بارە خەبەر
ناوی تۆ ناونوس نیە لای من لەسەر قیدی بەشەر
ڕەنگ بێ تێکەڵ بوبێ قیدی تۆ لەگەڵ ئاژاڵ‌و مەڕ
پێستی تو سهواً شتیکی تر ئەبی کردبێتە بەر
ئەو لەجێی تۆ بۆتە سەردارو ئەتۆش وا لاتو گەڕ
تۆ لەژێر ئازار ئەناڵی ئەو ئەژی ئەمڕۆ بەفەڕ
تۆ بچۆ لای قۆنتەراتچی پێ بدە ئێستا خەبەر
پێی بڵێ (لالو میکایل) کوانێ ئامچەم بێنە دەر
یا بگەڕێ بۆتان لەقیدی زیندەوارا پەڕ بە پەڕ

* * *

من بە فەرمودەی خودا چومە سەرایچەی ڕوزی دەر
توپەڵێکم قوڕ بەشیوەن خستبو سەر شان‌و سەر
ئەمقیژان لالۆ میکایل فەرمو زوکە بێرە دەر
پێم نیشاندە دەفتەری خەڵکی خودا بێ فیل‌و گەڕ
من کە عینسانم ئەبێ بۆ بمدەنێ ئالیکی کەر
ڕۆزی منتان کوا بەکێ دا ڕۆزی بەخشی بێ هونەر
خوا منی ناردوتە لای تو بو ئیعادەی ڕوی نەزەر
لالۆ میکایل بەگورجی ئامچەمی هێنایە دەر
دایە بەرچاو لاپەڕەی گشت ئادەمی‌و ئاژاڵ‌و کەر

* * *

دای بەسەر خۆیا بەدو دەست زۆر بەسوز کەوتە فغان
لالۆ میکایل ووتی ئەی ئادەمی بەستە زمان
من ووتم چی بو ووتی سەهوێکی زل چۆتە مەیان
تۆ بە شێخ خوا کردبوتی بەختەکەت نەیکرد جەوان
پێستی تۆیان کردە بەر کەر بو بە شێخی (کەس نەزان)
بو بەخاوەن خانەقاو تەکیەو ژنی وەك دایە خان
موچەی ئەویان بە تۆ دا خواردنی تۆشیان بە مان
جا وتم تەگبیر چیە هەی دادو هەی ملیون ئەمان
لالۆ میکایل ووتی با بچینە خزمەت خوای جیهان

* * *

چوینە خزمەت خوا بەقیدو دەفتەرو فەرمانەوە
من لەلای خواش کەوتمە شینو گریەوو پارانەوە
خواش ووتی مەگری کوڕم بێ سودە گشت لالانەوە
تەجرەبەی یاسای جیهان بەم کردەوەو ئیشانەوە
هەڵ ئەسوڕێ جێگەی خۆی توند ئەکا لەخولانەوە
تا شتی وا ڕونەدا (کەر نەچێتە جێی ئینسانەوە
ڕێکوپیکی گەل ڕەها نابێ لەچنگ نوقسانەوە
سازومانی گیتی ڕێك ئەخرێ بەئەم سهوانەوە
شۆستەی ئەم چەرخە بەستراوە بەئەم پەیمانەوە

* * *

نابینی قانونی گەردون ڕۆژ بە ڕۆژ دەستکار ئەکەم
نازو خۆشیو بەختیاری من بەپیاوی بەد ئەدەم
دەستەی زاناو هونەربازان وەبەر لێدان ئەدەم
زۆرتری پیاوی بلیمەت دیلی دەست نامەرد ئەکەم
هەر تۆ مغدور نی لەگێتی شاهیدیتان بۆ ئەدەم
ڕیزی سەربەستی پەیا نابێ ئەگەر من وا نەکەم
ڕسقی ئەو بۆ ئەم نەبەم ئەویان بەئەمیان پەت نەکەم
خوایەتیم بو ناکرێ ئەم ئالوگۆڕەی پێ نەکەم
توش برۆ بێدەنگ بە تا فکرێکی باشترت بۆ ئەکەم

## سکاڵا لەدەست گەل ١٩٤٤

(١٠)

خودا نەختێ تەماشام کە بەراستی زۆر پەرێشانم
بە چنگ کرداری ئەم ڕۆژە وەکو (سەی) بێ گەلو شوانم
ئەبێ هەرچی کە ببینم لەبالاو ڕیشی بڕوانم
شتێ لەم ڕوژە نابینم کە چون یەك بێ بەوجدانم
بەدەگمەن شت ئەبینم پێ نەجوشێ کانی گریانم
بە ڕاستی مردنم باشترە لەوەی بەم تەرزە بێ ژیانم

* * *

لە ڕوژیکێ حەسادەت بازیو زۆرداری کردوتم خودا چارێ
سەراپا دەوروپشتی گرتووم ڕەفتاری بەجارێ
درۆو بەدخویی ئەمڕۆ بوتە باو یەك چین لەهەر شارێ
ئەوەی ڕاستو ڕەوان بێ بێگومان لێ ناکرێ پرسیاری
ئەوەی دوڕوو و وتەدادڕ نەبێ ناژی بەهیچ بارێ
ژیان چنگ ناکەوێ تا نەبیە کەر بۆ باری زورداریّ

* * *

خودا تا کەی ئەو ژینە لەناو ئەم خاکە ڕەنگینە
ئەوەی فامی بەئیش بشکێ ئەڵێن پێ کافرو بێ دینە
ئەوەی زۆر سوكو ڕیسوا بێ ئەوە لای خەڵکی شیرینە
شیرازەی مەردو سەربەستیو حەیا لەم ڕۆژی نورینە
درۆو بوختانو فیڵو ڕوشکێنیو شیوەنو شینە
سەراپا بۆتە جێگای دز قەڵای ئەم خاکە نەخشینە

* * *

ئەوەی شێخە بە تەپڵو دەف عەوامی کرد بە کەر بۆ خۆ
ئەوەی کرمانجە دای هێشتوە گونی ئاغا بەسەر ئەستۆ
مەلای فیڵباز بەنوشتەو گشتەكو سیواکی تا ئەژنۆ
سەرانەی پۆلیسو مأموری دڵپیسی خودا گرتۆ
کەشیدەی مامە حاجی سوێندو بوختانە لەهاتوچۆ
بە ڕاستی شوێنی سەربەستی نەهێشتوە بۆ مرۆی ڕاستگۆ

* * *

لەوانەش پیسترو بەدتر وەتەن بازانی خۆ پێش خەر
بەفیشاڵو قسەی زل دائەنێن پیلانی هەستو گەڕ
لەناوخۆدا وەکو شێر و لەگەڵ بێگانە هەروەك مەڕ
بەنەختێ موچەی وەختی هەزاران نیشتمان پەروەر
ئەکەن توشی جەفاو بەندی بەبێ بارن وەکو جۆکەر
ئەمانە بونەتە پشتو پەنای بێگانەی بەدفەر

* * *

خودا یا بمکوژە یا ئەو بەدانە تۆ لەناو وون کە،
وەڵاتی کورد بەمانە بەس وێرانو پیسو خاپور کە
خودایە تۆ ئەمانە زو بە سەکسارو بەمەیمون کە
دەبەس ئەم خاکە نەخشینە خودا تسلیمی دەست دون کە
دە ڕۆژی گەل هەڵێنە ڕێی هەژاری خوایە دەی ڕون کە
بە فەوتانی ئەمان ئەم خاکی کوردستانە مەمنون کە

## تەپڵو دەفی شێخ ١٩٤٦

(٢٧)

تەپڵو دەف وا کەوتەڕێ دێوانە هەڵپەڕکێ ئەکەن
وا لەبەردەم شێخەوە وەك جاشی تورِ سەرسم ئەبەن
زەرگو شیر دەرزی لەلاگوپو لەسەر مەشکە ئەدەن
وەك سەگی هار داروبەردی بەردەمی شێخ لول ئەدەن
وا بەریز ماریان لەمل کردوە خەڵك تەهدید ئەکەن
مەنجەنیقی ئاگرینیان پێیە واخۆی تێ ئەخەن
شێخی شەیتانیش پەیا پەی وەك دلێری کارزار
ئەمری تەشجیع یان ئەدا بۆ کردنەوەی دوپشكو مار

* * *

دەستە دەستە پیرو گەنج لەم داوەدا ئەتلێنەوە
چین بەچین ڕیزی ژنیش بۆ دەستی شێخ دادێنەوە
کچ بەکۆڵی شەرمەوە پەردەی شەرم ئەدڕێنەوە
وەك پەپولە وا بەدەوری چاوی شێخ ئەخولێنەوە
داوی داناوە قۆرمساغە بە ڕوی چەند وێنەوە
ئەم گەلە دڵ پاکەیەی کردوە بەتوشی خوێنەوە
شێخ بەناوی خوایەرستی کورد لەیەزدان هان ئەدا
دەرسی بێ شەرمی نیشانی هۆزی کوردستان ئەدا

* * *

غەربی کەشفی مانگ ئەکەن شێخ تازە تەکیە دائەنێ
خەرج و پیتاک و سەرانە وا بەسەر خەڵکا ئەنێ
کارەبا دەستی پزیشکی گێتی کردە گوڵشەنێ
شێخ بە ناخیری بەنوشتەو گشتەک و هەودا بەنێ
کەشفی شێت و هار ئەکا مکرۆبی سیل هەڵ ئەکەنێ
ڕوس ئەوا مانگی دروست کرد ئەم جنۆکە ڕاو ئەنێ
بەم دەمە فێڵاویەی چەند لاوی کردوە سەرنگون
کەی ئەبێ هێزێکی ئازا ئەم سەگەم بۆ بکا زەبون

* * *

ڕۆڵەکان هۆش تان هەبێ چیکە بەشێخ تەفرە مەخۆن
چیکە بەدوای ئەم تەڵەبازانەدا هەرگیز نەڕۆن
چاو لەسەربەستی جیهان کەن بەس لەخزمەت شێخ بنون
شێخ بەکەرتان تێئەگا پێیخوشە هەروابن زەبون
چونکە شێخ ئەمرێ ئەگەر ئێوە بەلایا نەچون

چیکە مەیدانیان مەدەن نانی خوساوی مفت بخۆن
دەست و پێوەندی لەگەڵ شێخدایە پیاوی ئەجنەبین
کاکی ئیستعمار ئەمەی دروست کرد هەتا عاقڵ نەژین

* * *

کوردە ئیتر بەسیەتی باوەڕ بە شێخ چیکە مەکەن
شێخ بەکەڵکی چی ئەشێ کەی چارەی دوزەخ ئەکەن
هەرچی شێخە وا لەناو گەرداوی تاوان گیان ئەدەن
تۆ بەهیوای چی ئەوەندە دیڵی گاڵتەت پێ بکەن
هەر خوداو نیشتمان بناسن پشت لە ئەم سحرانە کەن
فەرقی شێخ و (بوت) چیە گەر ئێوە باش سەیری بکەن
هەردولا هەر پیسە ناسینیان ئەگەر باوەڕ ئەکەی
خوا بەنیشتمان تۆ ئەبەخشێ نەك بە شێخ و زەرگەکەی

## بەسەرهاتی پەپولەیەکی شێواو ١٩٤٤

(١١)

نیگایکی گوڵ تەکانێکی دڵ
لەسەر چڵێکی نەختێ بەسێبەر
پەپولەی سەرسام کەمێ حەساوە
هەناسەیێکی شێوە بەختیاری
لەتۆزی ڕێگا تاوێ خۆی تەکان
وەك حەز لێ کردو بۆماڵی دڵدار
سەرپۆشی ڕێگای لەسەر داماڵی
وەکو برسییەکی یەك جار چاوچنۆك
بەراویژێکی شیرین و ناسك
بەسەرهاتی خۆی بۆ گەڵاو بۆ چڵ
بە دەمی کوڵی لێوی گوڵی مژت؟
ڕوی کردە گوڵی کەمێ پوشکتو
بۆنی بەتینت هەراسی کردوم
لەم وەختەی کەتۆم دیوە لەسەر چڵ
هەر سەودایکم کە لەسەردا بو
هەتا من مابم ڕێز دامێنت
لەمەولا ئیتر گیانی شیرینم
لەهەر وەڵاتێ بۆنی تۆی لێ بێ

پەپولەیێکی خستە باوەشی چڵ
هەڵ نیشت و چاوی بریە گەڵای تر؟
باڵە ماندوەکەی توزێ لێکناوە
هەڵکێشا بەدڵ لەچڵی نواڕی
بۆیەی زێرکفتی دا لەسەرو شان
بچن لەخۆی دا خشڵی دڵفشار
بەسەر گەڵای گوڵ ڕایکێشا باڵی
فرمێسکی ئەرشت چۆڕ چۆڕ بەتنۆك
ئەیگێڕایەوە بەدەست و باسك
کە چەند دەمێکە شێواوە بۆ گوڵ
ئارەقی شەرمی بە گۆنادا ڕشت
کە ئەی نازداری بەشەرم و ئابڕو
شێوەی نازدارت سامانی بردوم
دڕکی چڵی تۆ پێکای کانی دڵ
بە ڕەنگی ئاڵت لەکەللەم دەرچو
بەرنادەم ناکەم تەرکی جێ و شوێنت
بەتۆ ئەبەخشم ئارامی ژینم
ئەبێ گیانی من لەم شوێنە دەرچێ

تاکەی دڵ بەخشم بەدۆستی لاسار
دۆستی بێ هەست و بێ جلوەو گوفتار

خۆ من دیقم کرد بەدەست چرای ڕون
چەند من خۆم سوتان ئەو نەبو ممنون

بڕیارم وابێ ئیتر تا ماوم
چرا نەناسم چەند بۆی سوتاوم

دوستێ ئەوەندە هەرزەو سەرکەش بێ
بەکەڵکی چی دێ هەرچەند کە گەش بێ

سکاڵای لەدەست چرا بۆ گوڵ کرد
بەبێ وەفایی ئابڕوی چرای برد

گوڵی سادەڕو بەزەیی پیا هات
بەم فرمێسکانەی لەکانی ئاوات

کەوا ئەی ڕشتن بەسەر ڕوی گوڵدا
بەکوڵ ئەناڵێ لەژێر پێی چڵدا

### وەڵامی گوڵ

وەڵامی داوە گوڵی شیرین ڕو
ووتی پەپولەی ئاشفتە بنو

وا وەرمگرتی بەدڵداری خۆم
لەمەولا ئیتر من دڵداری تۆم

بە ڕۆژو بە شەو دەست لەملان بە
دڵداری گوڵ و ئاشنای چڵان بە

پەپولە هێندە کش و ماندو بو
لەباوەش گوڵدا کە تاسی دەرچو

هەندەی گوڵ هەڵ مژت تا خەوی لێ کەوت
لاشەی پڕوزاوی کە نەختێ سرەوت

وەهۆش هاتەوە لەخەو ڕاپەڕی
چاوی خەواڵوی کەمی هەڵ بڕی

کە سەرنجی دا شەوە چراخانە
هەر تیشکی چرایە لەناو باخانە

ئەوەندەی جوان بو سەد ئەوەندەی تر
ئاڵ و واڵ بوبو لای ئەمی دڵ بڕ

دەستی لەمل گوڵ بە گورجی بەردا
تیشکی چراخان گڕی تێ بەردا

### پەپولەو دەردی ئەوەل یاری

روی کردەوە گوڵ ئەی گوڵی نازدار
سپاست ئەکەم بەدڵی شەرمەزار

من شەرمەندەی تۆم بەڵام لەگەڵ دڵ
بڵێم چی چی بکەم ئەی فرشتەی گوڵ

کە سەت ئەوەندە چرا بم کوژێ
خوێنی بەدبەختم بەدو لێو بمژێ

چونکە هەوەڵ جار دڵم پێ داوە
نیگای تاڵ تاڵی دڵمی گرداوە

چون هەوەڵ دۆست و هەوەڵ دڵدارە
هەر ئەمی ئەوێ دڵەی پەتیارە

شەوی دوسەد جار کە بمسوتێنێ
ئێسقانم بهارێ و گیانم دەربێنی

سوتانەکەی ئەو بەدەستەملانی
دۆستێکی تازە نادەم کەبزانی

دەردی هەوەڵ دۆست بەبێ دەرمانە
هیچ چارەی نیە لەئەم جهانە

من بەدناو بووم بەناوی چراوە
ئەویش بەمنەوە ناوی زڕاوە

جەفاو ئازاری ئەمو وەفای من
ئەبێ بچێتە ناو گۆڕو کفن

دڵدار بەپەنجەی دڵپێدراو نەمرێ
کەی ناوی ڕاستی پەیمان وەرئەگرێ

من بۆ دۆستی تۆ ناشێم بمبەخشە
ئەمن سوتاوم بەم نورەگەشە

هەروەکو بولبول بەتۆ بەدناوە
منیش بەم گڕە گیانم سوتاوە

تۆرانی دڵدار لەیاری دڵبەر
شتێکە وەختی پێ ناکرێ باوەڕ

بەخوات ئەسپێرم گوڵی بۆندارم
بۆ ئاشتکردنەوەی چرا ناچارم

گڕێ لەدڵما هێندە بە تینە
خۆشی باوەشم لا بەندو شینە

ئیمشەو ئەسوتێم ناگەمە بەیان
لەگەڵ ئەمەشا ئەڕۆم گوڵە گیان

## کچگەل نەورۆزە

## لە ١٩٤٤ لەکاتی حکومەتی قازی محمد بڵاوکراوەتەوە

(٤٩)

کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە    جەژنی ئازادیو سەربەستی هۆزە
وەرن با بیکەین جەژنە پیرۆزە    نیشتمانمان یەك جار خنجیلەو قۆزە
بەدکار گوشیویە بۆیە ئاڵوزە    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادیو سەربەستی هۆزە

* * *

کورگەل سێرانە کچگەل سێرانە    نۆرەی هەڵپەرکێو خەنەبەندانە
لە سابلاغ ئەمرۆ گوڵاو پەخشانە    بەیانی سەردەشت, ئێوارە بانە
دڵدار ئەخاتە شێوەی ئەفسانە    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادیو سەربەستی هوزە

* * *

ئەمرۆ لەناوچەی سەقزو بۆکان    تەوریز خاتونو، سنەو کرماشان
زەرزە،و گەورکو، شنو، تا لاجان    ئەشنێ لەژێری کچانی ئێران
خونچەو نبوشە نەرگسو ڕێحان    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادیو سەربەستی هۆزە

* * *

ناوچەی (باشقاڵو) بەتلیسو سیواس    جزیرەو دیرسم جەلالیو سەڵماس
ئاکرەو ئامێدی، دهۆكو باتاس    مەنگورو پژدەر باڵەكو بلباس
شەماڵ کردویە بەبۆنی گوڵ کاس    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادیو سەربەستی هۆزە

* * *

دزەو زەنگەنە داودەو تاڵەبان    پیرانو خۆشناو، ئاکۆ هەورامان
جافو شارەزور لورو فەیلیان    خۆیان ئامادە کردوە وەك جیهان
بە وێنەی بارزان ڕەوتی مەریوان    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادی سەربەستی هۆزە

* * *

هەڵەبجەو پێنجوین چوارتاو شارباژێر    سولەیمانیو کومەرگە هەتا گویر
ڕانیەو قەلادزە کەرکوكو هەولێر    کفریو ڕەواندز خانەقیو شلێر
بە تارای گوڵان بونە پارچەی زێر    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادیو سەربەستی هۆزە

* * *

کوردستان ئەمرۆ بەگوڵ نەخشاوە    سوسنەو یاسەمەن چواردەورەی داوە
بەرگی تازیەی لەبەردا دڕاوە    کەلەپچەو زنجیر تێکرا شکاوە
ئەمڕۆ ئازادیو سەربەستی باوە    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادیو سەربەستی هۆزە

* * *

کورگەل هەلیەتی کچگەل ئاوەرن    چارۆکەی شەرم لەسەر هەڵ گرن
کاتی فەرمانە لەخەو ڕاپەڕن    لەم ڕوژە تازە بەشتان وەرگرن
دەستی یارمەتی بۆ (گەلان) بەرن    کورگەل نەورۆزە کچگەل نەورۆزە
جەژنی ئازادیو سەربەستی هۆزە

**بۆ بیرەوەری فائق بێکەس بوێژی هەرەبەرزی کورد**

**لە رۆژی ١١/١٢/١٩٥٨ لە سلێمانی لە کۆبونەوەیەکی گشتیدا خوێنراوەتەوە**

( ٢٥١ )

بێکەس کورد بو بێکەس کورد بو      بوێژێکی زاناو وورد بو
لە ڕاپەڕین دەستو برد بو      ڕێگای ڕاستی وون نەکرد بوو
نیشتمانی خۆی زۆر خۆش ئەویست      بۆ سودی گەلی چی با بەبێ ویست
ئەیکرد ئەی ووت ئەی بیست      ئەستێرێك بو لە چەرخی بیست
لە ئاسمانی کورد ئەخولاوە      ڕوناکایی لێ ئەتکاوە
هێزی پەستی پێ ئەتواوە      بەم هەڵبەستانەی دایناوە

بێکەس کورد بو زۆر دڵسۆز بو
چەکی دەستوەکەری هۆز بو

بێکەس بۆ کورد تێ ئەکۆشی      کوردێك نەبو گەل بفروشێ
لە ئازادی چاو بپوشێ      هەر بۆ کورد بو دەنگو خرۆشی
ئەی ویست هەمو کورد یەك دەنگ بێ      یەك ئاواتو هەولو ڕەنگ بێ
یەك ئامانجو ڕەوتو چەنگ بێ      یەك هەڵمەتو تاوو جەنگ بێ
ئەیویست کوردیش لەناو جیهان      ببێتە خاوەن ناوو شان
بەسەربەخۆیو کاری جوان      تێکەڵاو بێ لەگەڵ گەلان

بێکەس کورد بو، کورد پەرست بو
دڕکی چاوی پیاوی سست بو

بێکەس بێگانەی لا پیس بو      یەکەم دوژمنی ئینگلیس بو
کەوا ڕوتو لاتو سیس بو      دەستیان بەست بوو دەم قەتیس بو
لەگەڵ ئەوەشدا وەك گڕ بو      ڕەزم گێڕو گوتار گڕ بو
چاونەترسو جەرگ بڕ بو      دوژمن کوژو بەد دادڕ بو
ئەیویست زۆردار هەر نەمێنێ      هەژار ڕەنجبەر پێ بگەیەنێ
ئاشتی لە گەردون پێکبێنێ      کەلەبچەو زنجیر بشکێنێ

بێکەس کورد بو بۆ کوردستان
تێ ئەکوشا بەبێ وەستان

بێکەس ئەیویست خاكو ئاوی      بەکوڕ بەکچ ژنو پیاوی
سەربەخۆ بێ بە تەواوی      بە ژێردەستی بە بەدناوی
نابێ بژی ژێر چەپوك بێ      گەلی پەتیارەو ناکۆك بێ
خزمەت کارو ترسەنۆك بێ      بێ دەسەڵاتو (قرپۆك) بێ
ئەبێ گەل خۆی بناسێ کێیە      خاوەنی کام ناوچەو جێیە
کێی پێ ئەڵێن خەڵکی کوێیە      مەرزی لە کوێوە تا کوێیە

بێکەس کورد بو بۆ ڕەگەزی خۆی
نەئەدوڕا هەرچەند ئەڕوی

بێکەس ئەی ویست کە کوردستان      ڕزگار بکا لەژێر دەستان
ئەمجا هەستێ بەبێ وەستان      بچێ بۆ هانای بێ دەستان

ئەیویست خوێنمژو زۆرداری    ریشەکێش کا بەیەك جاری
گەل ئازادکا لە هەژاری    بیکا بەیەك لادێو شاری
داری ئازادی بروێنێ    تاوی زۆرداری بشکێنێ
یاسای سەربەستی دابنێ    مافی کورد چیە بۆی بستێنێ

بێکەس کورد بو هەزار خابن
ئەیدی رەمی قەڵای دوژمن

جا ئەی گیانی پاکی بێکەس    بە بێکەس بڵێ زۆر بە هەوەس
موژدەی لێ بێ بەهێزی دەس    کۆشکی زۆردار هێنای هەرەس
ئەو دەوڵەتەی کە ئیستعمار    دروستی کردبو لە تەختەو دار
ئەفسەرێکی سوپای نازدار    هەر بەشەقێك لەناو رۆژگار
دەری هێناو پێچایەوە    هەروەکو (مۆم) توایەوە
بە وەزیرو پاشایەوە    ناویان لە مێژو سرایەوە

بێکەس کوردبو ئەوەی ئەویست
داخی گرانم تا ما نەیبیست

بێکەس, لەدوای نەمانی تۆ    کورگەل هەستان وێنەی هەڵۆ
گەل دانەنیشت دەستەو ئەژنۆ    لەناویان دا بەدو بەدگۆ
گەل یەکی گرتو راپەری    شێرێ لەناو گەل دەرپەری
دەستی ئازادی هەڵبری    نوری‌و وەصی‌و شای دادری
بتو بوتخانەی شای تێکدا    دەستوری کۆنی ژێر پێدا
ئەوەی رۆی بون بەلا رێدا    زنجیری گەلیان لە پێدا

ئەمرۆ لەناوچەی کوردستان
شای‌و بەزمە بەبێ وەستان

بێکەس.. لەهەرلا هەرایە    هەڵپەرکێ‌و بەستەو سەمایە
زیرەی تارو چەنگو نایە    زمان, پێنوس, بەرەڵایە
وا زەویوزار دابەش ئەکرێ    رەنجبەر هەژار بەش وەرئەگرێ
ماڵی (ئاغا) بەلات ئەدرێ    بێ خانو خانوی بەو ئەکرێ
زیرەی زنجیر هەر نەماوە    پاشایی (جەمهوری) ناوە
کورو کچ یەك دەنگو باوە    فێڵباز تەواو پشتی شکاوە

کوردو عەرەب ئەمرو بران
یەك ئامانج‌و یەك خوو سوپان

پاشەرۆژی کورد روناکە    ئیشمان ئەروا بەرەو چاکە
کورد ئەمرو خاوەنی خاکە    ترسی نیە زۆر بێ باکە
کوردو عەرەب وەك یەك ئەرۆن    بەسەری یەکتر سوێند ئەخۆن
سوتا رەوشتو تەرزی کۆن    شکا بازاری پیاوی مۆن
هەر لە مۆسکو تا نیل‌و چین    زۆربەی ئەوروپا تا بەرلین
بە هێزی بازو هەوڵو تین    ئەمرۆ لەگەڵ ئێمە ئەژین

بێکەس کورد بو بە کوردی مرد
خواتان لەگەڵ رۆڵەی نەمر

# نمونەیەك لە نوسینی مێژوو

میرزا مەنگوری

## کورد و ڕاپەڕینی لە ساڵی ١٩٦١ دا

حکومەتی قاسم لە ڕۆژی ٢٥/تەموزی/١٩٦١ (کریم قەرەنی) ئامر ئینظباطی عەسکەری نارد بۆ ڕانیە. (حەسن کانبی بڵباس) و (عەبدرەزاق) مەئموری گەنجینەی ڕانیە و (شێخ حەمیدی شێخ خدر) و (دڵشاد ڕەسولی) و (شێخ حسین بۆسکین) و (کوێخا مینەی خرەجۆی) گرت و مەحکەمەی عەسکەری ئینزاری (عەباس ئاغای مامەند ئاغا) و (اسماعیل ئاغای پیران) و (شێخ حسین بۆسکێنی) کرد ئەگەر هەتا (١٤) ڕۆژی تر تەسلیمی نەفس نەکەن بە دادگای عورفی بەدترین ئازاریان نیشان ئەدرێ. حیزبیەکان ڕانیەیان چۆڵکرد کە ناودارەکانیان بریتی بوون لە: (عەزیزی فەقێ سمایل) و (تۆفیقی ملا صدیق) و (مەلا فاتح) و (صدیق ئەمین) و (عەزیز بەگی صدیق بەگ) و (میرزا باپیر) چونە ناو کۆمەکی (عەباس مامند ئاغا) لە دێی سەرکەپکان.

لە ڕۆژی ٣٠/تموزی/١٩٦١ حیزبی پارتی مذەکەرەیەکی بە (١٥) مادە دا بە حکومەتی قاسم داوای ئازادکرانی کوردانی لێ کرد. لە هەمان ڕۆژدا (عەباسی مامەند ئاغای ئاکۆ) لەگەڵ (ئیسماعیل ئاغا) و (سوار ئاغای پیران) و (شێخ حسین بوسکێنی) و (شێخ جەلالی سید ئاوا) و (عبدالە ئاغای ئاکۆ) و (زراری کاحسن بڵباس) و (ئەسکەندەری مام ڕەسولی پیران) بە لەشکرێکی چەکدارەوە چون بۆ دۆڵی (خەلەکان).

دەستەی حیزبی ڕانیەش چونە ناو لەشکری عەشایرەکانەوە لە هەموو لایەکەوە حیزبیەکان لە دۆڵی (خەلەکان) کۆبونەوە لەشکری (اسماعیل ئاغا) و (زرار) و (جوادی شفیق ئاغا) چون بۆ (چنارۆك) و (گومەتاڵ). لەشکری (باپیری بابکری سلیم ئاغای) پژدەری لەگەڵ لەشکری (حمەی هەباس ئاغای میراودەلی ) و (مامەندی سەلیم ئاغای قەڵادزە و لەشکری هەر چوار تایەفەی میراودەلی ئیشتراکی جەبهەی خەلەکانیان کرد.

گۆنگەڵی داوا و ماف سەندن گەرم بوو، عبدالکریم قاسمیان ڕاچڵەکاند. هەر لەم ڕۆژانەدا کاك (جەلال تاڵەبانی) و (عمر دبابە) ئیشتراکی ئەو لەشکرکێشیەیان کرد لەهەمو لیوای سلێمانیەوە دەستکرا بە لەشکر کۆکردنەوە. (کوێخا سمایلی تەلان) لەگەڵ (کاکە حەمەی) برایا چون بۆ ڕێبەندانی دەربەندی بازیان. ڕێگای (ئەزمەڕیش) لە لایەن (شێخ محمودی کوڕی شێخ عومەری کارێزە) و (شێخ کەریمی موکەبە)وە بەسترا.

(حاجی برایمی چەرمەگاش) سواری ئوتومبێل بوو دەستی کرد بە گەڕان بەناو عەشایرەکانی (شارەزور) و (سەرچنار) بەهۆتاف کێشان و سرود خوێندنەوە بەناو بازاڕی سلێمانی و بەردەمی سەرای حکومەتی بە (٢٠-٣٠) ئوتوموبیلەوە تێئەپەڕین. لە هەمو لایەکەوە خەڵك چاوی کرایەوە و بۆ ڕاپەڕینی شۆڕش خۆی ئامادە کرد. حوکومەت تاسانێکی گەورەی بەسەردا هات. (عەباس ئاغای مامەند ئاغا) چوو بۆ دێی (سیتەك) لە شارباژێڕ (شێخ لەتیف)یشیان تا ئەندازەیەك هێنایە سەر باری شۆڕش.

دەستە و دائیرەی (حمە رشید خانیش) لەگەڵ بەگزادە و عەشایری جاف لە (دەربەندیخان) لەشکر بەزیان کرد هەتا خانەقین ڕێبەندان دەستی پێکرد. لە ناوچەی زاخۆ (دهۆك) و (عقرە) و (ئامێدی) و (ڕەواندز) و (شەقلاوە) و (موصل) و (هەولێر) هەمان لەشکرکێشی و ڕێبەندان دەستی پێکرد. حیزبیەکان لە هەموو لایەکەوە کەوتنە تێکۆشان. ئەوەی کە لەشارەکان خۆی نیشاندا بوو چ لە شاگردی قوتابخانەکان و چ لە موچەخۆر و کاسپکارەکان بۆی هاتنەدەرەوە و شاریان چۆڵ کرد. لەشکرەکەش بڵاوەی پێکرا. دعایەی حزبی لە هەموو لایەکەوە بەرزبۆوە. ئەوەی کەڕۆحێکی کوردایەتی تیابو سەری بەرزکردەوە و بە پارەو یارمەتی دەستی برایەتی بۆ شۆڕش درێژ کرد. نقابەکان دەستیانکرد بە تێکۆشان و یارمەتی ناردن لە نان و خۆراك و جل و پارە.

حکومەت تەنگاو بوو کەوتە ڕایەڵکەی فرۆفێڵ بەهۆی کاربەدەستانی میری و دۆستەکانی. لە هەمو لایەکەوە کەوتە وتووێژ لەگەڵ حزبی و عشایەرەکانا. بۆ ئەوەی کە ساردی بخاتە ناو شۆڕشەوە و هەلیان لێ بدوڕێنێ. لەو کاتی تەنگو چەڵەمەی شۆڕشدا

لە دێی (دیلۆ) و (میرتکان) لە نێوان پژدەری و (مامە شەرشکەکانا) بوو بەشەڕ. (٢٤) کەس لە هەردولا کوژران. (شێخ حسینی بوسکێن) و (مامەند ئاغا) لەگەڵ حیزبیەکاندا لە ڕۆژی ٨/ئابی/١٩٦١ بەم ئیشە هەڵسان و نەیانهێشت ئەو ئاژاوەیە پەرەبستێنێ و دایانمرکاندنەوە. لە ڕۆژی ١٩/ئابی/١٩٦١ دا (عبدالهادی صالح مختار) ئوستانداری سلێمانی بۆ دابینکردنی ئەو بەسەرهاتە و کوژانەوەی ئاگری شۆڕش لەگەڵ قایمقامی ڕانیە (مرتظی الاعرجی) لە دۆڵی (خەلەکان) چاویان بە (عەباسی مامند ئاغا) و (مام جەلال) و پیاوە ناودارەکانی عەشایەری و حیزبی کەوت. بەڵێنی دانێ کە بۆ تەنفیزکردنی مادە (٣) لەسەر ئەو مزەکەرەیەی کە دراوە بە زەعیم عبدالکریم قاسم ئەوساتی بەرجەستەی حکومەت بدوێنێ. بەمەرجێ هەتا ئەگەڕێتەوە لەسەفەری بەغدای هیچ ڕوداوێکی ناخۆش دروست نەکەن.

ڕۆژی ٣/ایلولی/١٩٦١ (عبدالهادی مختار) هاتەوە خەلەکان ووتی: (حکومەت تەنیا ئەتوانێ دۆنمتان بۆ زیاد بکات و ئیصلاحی زراعیش لە ناوچەی شیمالا تاجیل بکات بۆ کاتێکی غیرە معلوم) بە زمانی کوردیش خوێندن لە قوتابخانەکاندا پێکبێنێ، بەڵام حیزبیەکان کە ئەو هێز و چەکانەیان لە پشت خۆیانەوە ئەبینی گاڵتەیان بەم قسانە ئەکرد. هەرچەندە عەشایەرەکان لە بارەی ئیصلاحی زراعیەوە تۆزێك مات بووبوون بەڵام بە تەواوی دەستیان نەئەگەیشتە حکومەت کە لەبنەوە تێی بگەن حکومەت چ بیرێکی هەیە دەرهەق بە ئیصلاحی زراعی ئەگەر ئاغایان دژ بەم شۆڕشە بوەستن.

پێش هەڵایستانی شۆڕش ئەوەبوو لە (٦) ی ئەیلولدا مانگرتنێکی گشتی دەستی پێکرد، لە هەموولایەکی کوردستاندا کە ئەوەش بوو بە داگیرسانی ئاگری شۆڕشی ١١ ی ئەیلولی ١٩٦١. هەر ئەوەندە زانرا لە ڕۆژی (١٠) ئەیلولی ١٩٦١ حکومەت بەتەیارە لەهەموو ناوچەی شمالا مناشیری بلاوکردەوە. کەجیش بۆ سەرانسەری شیمال تێ ئەپەڕێ ئەبێ بەرەو پیریەوە بچن و پێشوازیی خۆشەویستانەی لێ بکەن.

لە ڕۆژی ١١ ی ئەیلولی ١٩٦١ لەهەموو ناوچەی کوردستان لە نێوانی هێزی حکومەت و عەشایەرو حیزبی بوو بەشەڕ. پێشمەرگە بە غیرەتەکانی عەشایەر بۆی چونە ناو سەنگەرەکانی خاکی کوردستان. هێزی میری بە تانك و تەیارە و تۆپ و چەکی تازەی گردار پەلاماری سەنگەرەکانی پێشمەرگەی نەبەزی ئەدا کە پێشمەرگەکانی لە سەنگەرا هەڵ قەنی و ڕێگایەکان بکاتەوە کە هێزی میری پێدا بڕوا. چەند سەعات بەم ئاگربارانە بە قومبلەی ناپاڵم و تانکو تۆپ لەگەڵ هێزی کوردستان شەڕ خایاندی. لە ئاکامدا لەبەرئەوەی کە هێزی عەشایەر و پێشمەرگە ئەو تفاق و چەکانەیان نەبوو کە حکومەت بەکاری ئەهێنا. بە تایبەتی فڕۆکەکانی میری ناوچەی شەڕەکانی بە بۆمبی ناپاڵم و غاز هەموو سوتاند بە ناچاری (دەربەندی بازیان) وە (دەربەندی خان) چۆڵکران بە کوژرانی چەند سەرباز و ظابطێك ئەو دوو ڕێگایە بەڕەڵاکرا لە شەڕی دەربەندی بازیانا (کاکە حەمەی) تەلانی بە گیانێکی قارەمانانە شەهید کرا. وە لە دەربەندی خانیش (مصطفی محمد) خەڵکی (سوراو) شەهید کرا.

(ئیسماعیل ئاغای سوار ئاغای پیران) کە سەرکردەی لەشکری عەشایەری ناوچەی هەولێر بوو، لەبەر نەشارەزایی وەنەبونی ئیستخباراتیان نەیانزانی بوو کە هێزی میری بەرەو کۆیە دێ چ لە هەولێر و چ لە قوڵی کەرکوکەوە. تەنیا هەر بەوە ڕاگەیشتبوون کە هەڵێن و بکشێنە دواوە و خۆیان دەرباز بکەن. هێزی (عقید کافی) لە هەولێرەوە بە ئاسانی گەیشتە کۆیە لە (١٦/ئەیلولی/١٩٦١) دا هێزی تەیارە ناوچەی بارزان و زاخۆو عقرە و ئامێدی و دهۆکی زۆر پەرێشان کردبوو. لە هەموو لایەکەوە جبهە بەرەڵاکرا هێزی حکومەتی هاتە ناوشارەکان.



لە قوڵی خەلەکانیشەوە هیچ هونەر و ئازایەتیك لە لایەنی حزبی و عشائیرەکانەوە بەکارنەهێنرا. جگە لە کشانەوە و چوونە ناو شاخەکانەوە هیچ شتێکی تریان بەکارنەهێنا. هێزی حزب و عەشائیرەکان هەموویان خزانە ناو شاخەکان و ڕێکانیان بۆ هێزی حکومەت چۆڵکرد. تەنیا لە ڕۆژی (٢٠/ئەیلول/١٩٦١) شێخ ئیسماعیلی شێخ خدری سیدئاوا لە پشتی (دێی سید ئاوا) لەگەڵ هێزی عقید کافی بەشەڕ هات (١٥) سیارەی جیشی بەدیل گرت و (٣) جندی بریندار کرد و دەستکەوتی فیشەك و بەتانی و تەقەمەنی دەستیان زۆر بوو.

لە ٢١/ئەیلولی/١٩٦١ هێزی عقید کافی بە تەواوی شاخەکانی پشت سید ئاوا و کێوەڕەشی ڕانیەی ئاگرباران کرد چ بە فڕۆکە و چ بە تۆپ لە هەمان ڕۆژا لە پشت (سید ئاوا) ڕەئیسی ئەوەڵ (حەسن

وایلی) و دوو جندی کوژران. هێزی عقید کافی لە ڕۆژی دوایی دا سەنگەسەری گرت. مەسئولی حزبی سەنگەسەر (محمدی عبداللە درسن) لە گەڵیان کەوتەشەڕ بە بریندارێ لەناو دێ ی (سنگەسەرا) گیرا و درایە دادگای زەمانی جەنگ.

نوری احمد طە لە لایەن حزبەوە بەپەلەپرۆزە خۆی گەیاندە هێزی (دەربەندی خان) کە پێویستە ئینسحاب بکەن چونکە هێزی حکومەتی لە دەربەندی بازیان تێپەڕی کردوە. ئەم خەبەرە بوو بەهۆی کشانەوەی هێزی عەشایەر و پێشمەرگە لە دەربەندیخان. لەشکری عەشایەر و حیزبیەکان بە بێ هیچ بەرگریەك جەبهەکانیان چۆڵکرد. حکومەت لە هەموو لایەکەوە دەستی کرد بە گیرانی ئەو کەسانەی سەر بە شۆڕش بوون. لە ڕۆژی (١) ی تشرینی یەکەمی ١٩٦١ فەوجی عقید کافی و محمود خەفاف لە سلێمانی و کۆیەوە هاتنە ڕانیە. هەموو ئازایەتی و هونەرێکیان ئەوەبوو کە (مام پیرۆت) ناوێکی ئاکۆیی هەژاری ئیختیاریان لە نزیك ڕێگای (هەنجیرە) ی ئاکۆ کوشت.

لە ڕۆژی (٢) تشرینی یەکەمدا فەوجەکان گەڕانەوە ڕانیەیان چۆڵکرد، لە قوڵی بارزانیشەوە لە ئاکاو لە ڕۆژی (١٩٦١/٩/١١) پەلاماری مەلا مصطفی درا، بە هێزی تەیارە بارزانیان هەموو ئاگردا. مەلا مصطفی خۆی دەربازکرد و ڕووی کردە قوڵی سوریە ئەو زستانە لە شاخەکانی ناوچەی زاخۆ و عقرە و ئامێدی و دەوروپشتی موصل خۆی لە کەمین دا.

عەباسی مامەند ئاغا و حزبیەکانی ڕانیە و قەڵادزەش بۆی خزانە ئەشکەوتەکانی دۆڵی شاور بە چاوەڕوانی داهاتنی بەهارەوە، هەندێ کەس بەم ناوانەوە لە ڕانیە گیران: (مەلا فاتح العسکری) و (ڕەئووف نوری تاپۆ) و (نوری میرزا غفوری-ملاحظی انحصار) و (حسین علی رضا) مسئول ناوچەی ڕانیە و (سید فیضة) و (حمدی برایم) و (ئەحمدی خیاط) پاشان بەڕێ کران بۆ سلێمانی و کەرکوك. عبدالکریم قاسم ئەمجا بەسەر کێشیەك و باهی بونێکەوە خطبەیەکی دا: (من لام وابوو بە (٧) ساڵ ئەم شۆڕش و کۆبونەوەیە بەتاڵ ئەکەمەوە. بەڵام خۆش بەختانە بە (٧) ڕۆژ دوایم بەم شۆڕشە هێنا).

عبدالکریم قاسم لە ڕۆژی (٢٣/تشرینی دووهەمی/١٩٦١) لە دەربەندی خان بە ناوی کردنەوەی (سدی دەربەندی خان) چاوپێکەوتنێکی گەورەی لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوەدا کرد و عەفوێکی گشتی دەرکرد. بەندیەکانی هەموو بەرەڵا کرد و زۆر کەس بەم بەخشینە لە شاخ گەڕایەوە. بەڵام عەباس ئاغاو دەستەی حیزبیەکان پتر چێشتە ئەبوون بۆ شەڕێکی گەورە لە بەهارا خۆیان ئامادە ئەکرد.

لە ئاخری مانگی کانونی یەکەمی ١٩٦١ لە ڕێگای (تەق تەقی) کۆیە. دکتۆر خالید لەگەڵ هێزی پۆلیس بە شەڕ هات گەنجینەی معاشات کە بریتی بوو لە (٣٠) هەزار دینار دەردەست کرا بە کوشتنی (٣) پۆلیس ئەو باسە کۆتایی هات. هەر لەم سەروبەندەدا (عەباس ئاغا و عومەر دەبابە) لە ناوچەی شاور تێکچوون. (عومەر دەبابە) لەگەڵ دەستەو دائیرەی حیزبی چوون بۆ بێتواتە. بێتواتەیان کرد بە بارەگای حیزبی، مەحمود کاوانی کە قاتڵی (صدیق میران) بوو ئەویش لەناو خۆشناواتا خۆی پەنهان دا. حکومەتی قاسم عەفویەکی گشتی لە ڕۆژی (٧/ئازاری/١٩٦٢) بڵاوکردەوە و تەیارەش بە ئیمزای قائد فیرقەی (٢) لە کرکوك عەفوی ناوبراوی بە خەڵك ڕاگەیاند.

وەفدێك کە بریتی بوون لە (برایم ئاغای مامەند ئاغا) و (شێخ جەنەت) و (حەمە کبتانی مامەند ئاوا) و (بابکری سلیم حاجی ئاغا) بە ناوی وەفدی ڕانیە و پشدەرەوە چوون بۆ لای مەلا مصطفی لە قەزای شێخان بۆ وەرگرتنی ڕەئی بۆ ئەم عفوەی کە حکومەت بڵاوی کردۆتەوە.

مەلا مصطفی وەڵامی دابونەوە من مانع نابم هەرکەسێ کە تسلیمی نەفسی ئەکات. بەڵام من خۆم هەتا ئاخیر هەناسەم شەڕ ئەکەم. مەلا مصطفی پێی وتبوون ئەگەر حکومەت ڕاست ئەکا متصرفی هەر چوار لیوای کورد لەگەڵ قائیدی فرقەی (٢) (ئیبراهیم ئەنصاری) و (فوئاد عارف) و (فاضل مهداوی) و (ماجید محمد امین رئیس و مدعی عامی محکمەی شعب) بێنێ بۆ لام ئەمجا من مطالبی کوردیان ئەدەمە دەست کە ووتووێژی لەسەر بکەن. وە هەر بەم تەرزە قاقەزی بۆ متصرفی موصل و قائید فرقەی کرکوك نوسیبوو کە بکەونە ناو مفاوەزاتەوە.

پێش نەتیجەی ئەو باسە لە ڕۆژی (١٩٦٢/٣/٢٠) دا لە (بازەگیر) و (پردی تەگەرانی) ڕێگای چوارتا لە نێوانی پێشمەرگە و پۆلیس بوو بەشەڕ پۆلیسێکی زۆر ئەکوژرێن و (٣) پێشمەرگەش بەدیل ئەگیرێن. ڕۆژی ١٩٦٢/٣/٢١ مەرکەزی ناحیەی سیوەیل لە لایەن پێشمەرگەوە ئەگیرێ و (جمال ڕەمزی) مدیری ناحیەی سیوەیل لەگەڵ مائمور مەرکەزەکەیا دەست بەستە ئەکەن. لە ڕۆژی (١٩٦٢/٣/٢٦) هێزی پێشمەرگە ڕێگای (خەلەکانی) بڕی و ئەو ناوچەیە کەوتە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە و هەر ئەو ڕۆژە (سەید علای) ظابط تجنیدی ڕانیەیان گێڕایەوە لەگەڵ چەند ئوتومبێلێکی میریدا. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٣/٢٥ دا لە ئەترافی (بالیسان) لە نێوانی هێزی پێشمەرگە و پۆلیسی غیرە نیزامیدا بوو بە شەڕ و چەند پۆلیسێك کوژران.

لە شەوی ١٩٦٢/٣/٢٨ جەیشی سوریە ئینقلابی کرد بە ناوی تتمەی ئینقلابی ٢٨/ئەیلولی/١٩٦١ کە بەریاسەتی دوکتۆر (کوزبەری) پێکهاتبو حکومەتی ناظم القدسی لەناودرا و جیش ئیدارەی دەوڵەتی گرتە دەست. لە شەوی ١٩٦٢/٣/٢٩ (شفیقی حاجی مارف) کە ئەمین حکومەت بوو لە ڕانیە لە لایەن کەسێکی نەناسراوەوە کوژرا. لە ١٩٦٢/٤/٣ لە شەریکەی (شیواشۆك) و (دار بەسەری) کۆیە هێزی پێشمەرگە و پۆلیس لێیان ئەبێ بەشەڕ لە ئاکامدا پۆلیسێك و پێشمەرگەیەك ئەکوژرێن و (٢٩) پۆلیسیش تەسلیم بە هێزی پێشمەرگە ئەبن وە بەچەکەوە ئەیانبەنە بێتواتە.

هەر لەو دەورەدا هێزی حکومەت لە هەموولایەکەوە لە ناوچەی شێخان و دهۆك و ئاکرێ بە تەیارە و لەشکر پەلاماری مەلا مصطفی و هێزەکانی ئەو ناوەی دا، بە ئەندازەیەکی زۆر زیانی بەم ناوچانە گەیاند. لە (١٩٦٢/٤/٧) هێزی پێشمەرگە پەلاماری مەرکەزی

ناوچەی (ئاخجەلەر) یان دا، مدیری ناوچە و مەئموری مەرکەزیان دەردەست کرد و چەکی پۆلیسەکانیشیان کەوتە دەست. لە ڕۆژی (١٩٦٢/٤/٩) پێشمەرگە پۆستەی حکومەتیان لە ڕێگای خەلەکان گیرایەوە. هەر لەم ڕۆژەدا خەتی تەلەفون لە نێوانی کۆیە و ڕانیە و قەلادزێ و سلێمانی پچڕێنرا.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٤/١٤ (علی عەینە) کە یەکێك بوو لە ئەندامی پارتی لە سلێمانی لە لایەن شرطەوە ئەکوژرێ. مەحمود خەفاف کە بەفەوجەکەیەوە بە هاواری ناحیەی ئاخجەلەرەوە ئەچێ لەگەڵ پێشمەرگە بەرەنگاری یەك ئەبن پێشمەرگە مەحمود خەفافی ئامر فەوج بریندار ئەکەن و چەند سەربازێکیش ئەکوژرێن. (عەباسی مامەند ئاغا) بۆ بەرهەڵستی هێزی عەشایەری (باڵەك) چوو بۆ ئەترافی (ڕەواندن) چونکە باڵەکان لە دژی پێشمەرگە جەبهەیان کردبۆوە.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٤/٢٠ کە موچە خۆرەکانی قەلادزێ ئەچن بۆ سەیران لە دێی (داودیە) دوو نەفەری چەکدار معاونی ئەمنی قەلادزێ (ئیسماعیل عبدالله) ناو ئەکوژن. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٤/٢١ (حمەی محی الدین) دەلالی سیارات لە ڕانیە بە ناوی جاسوسی میریەوە دەردەست کراو برایە بێتواتە. حکومەت فەحصی توتنی ڕاگرت کە نزیکەی (١٦) هەزار فەردە توتن مابوو فەحص بکرێ و (١٠٠) هەزار دیناری پارەی توتنی فەحصکراو مابوو کە بدرێتە خاوەنەکانی، مەبەستی حکومەت لەم مەتەڵە ئەوەبوو کە خەڵك لە پێشمەرگە و شۆڕش دڵشکاو ببێ، وە لەتاوی پارە و توتنەکانیان پاڵبدەنەپاڵ حکومەت و لایەنگری پێشمەرگە نەکەن.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٤/٢٦ (سلێمان) ناوی ڕانیەیی بە تاوانی جاسوسی گیرا و برایە بێتواتە، درایە دەست (مەلا عبدالله) کە مەشهور بوو بەمەلا ماتۆڕ بۆ تعزیب کە دەستێکی باڵای هەبوو لە تعزیبدا. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٤/٢٨ (ئەحمەد بەگی خدر بەگی شکارتە) بۆ ئیخباری لوتبڕانی هاتە ڕانیە کە لەسەر جاسوسی پێشمەرگە ئەتکی کردووە وە بەم یاسایە سزا دراوە، جا هێزی پێشمەرگە لە هەموولایەکەوە کەوتنە پەلاماردان بە هیوای ئەوەی کە حکومەتی قاسم بڕوخێنن.

## بەپێی نووسینی ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٤٦٥) لە نیسانی (١٩٦٢)

لە ڕۆژی (٧و١٩٦١/١٢/٨) دا هێزی پێشمەرگە لەناوچەی (زاوێتە) چوار فەوجی پۆلیس و (١٢٠٠) نەفەری جاش بەکۆمەکی (٦) فڕۆکەی نفاسە لەگەڵ چەند تۆپێکی شاخی لەگەڵ هێزی پێشمەرگە کەوتنە شەڕ و دوایی ئەو شەڕە بەکوشتنی (٣٦) نەفەر و (٧٣) بریندار تەواوکرا.

لەڕۆژانی (١٣ و ١٩٦١/١٢/١٤) هەر لە ناوچەی زاوێتە پێشمەرگەی قارەمان چوار فەوجی پۆلیسی خستە گەمارۆوە و دە تۆپ و فڕۆکەی بۆمباهاوێژ بە هەموو وێنە چەکێکیان لێ بەکارهێنان بۆ ڕزگارکردنی ئەو پۆلیسە ئابلۆقەدراوانە، بەڵام هەر چوار فەوج بەناچاری خۆیان خستە دەست هێزی بارزان. تەنیا مدیری پۆلیس و معاون و مفەوەزەکانیان گلدرانەوە. هەموو نەفەراتەکانیان لە دوای چەککردن بەرەڵاکردن کوژراویان (٦٣) نەفەر و برینداریان (١٨١) پۆلیس بوو. لە ڕۆژی (١٩٦١/١٢/٢١) هێزی دیموکرات (سوارەتوکەی) خستە گەمارۆوە. لە نێوانی هێزی قاسم و کوردستان بوو بە جەنگ، لە ئاکاما (٢٠) کوژرا و (٢٦) دیل لە جاشی پۆلیسەکان گیران لەگەڵ گرتنی (سەرسنگ).

لە ٢٦ و ١٩٦١/١٢/٢٧ لە (بەرواری باڵا) پێشمەرگە پەلاماری مەرکەزی ناحیەی (کانی ماسی) دا پۆلیسەکان هەڵاتن بەڵام (٢٦) کەسیان لێ کوژرا و (٤٣) نەفەریشیان لێ برینداركرا و (١٣٠) کەسیشیان لێ گیرایەوە محسن بەگی بەرواریشیان لەگەلا هەلات. لە ١٩٦٢/٢/١٥هەتا ١٩٦٢/٢/٢٠ لە ناوچەی (بەرواری خوارو) و (مزوری) لەگەڵ هێزەکانی (شیمن بریفکانی) و (محمود زێباری) و (عبدالله شرفیان) شەڕ دەستپێکرا. لە ئاکاما بە کوشتنی (٧) نەفەر و برینداری (١١) نەفەر ئەو ناوچەیە لە هێزی جاش پۆلیس و پیاوە بێ فەڕەکان پاککرایەوە.

لە ١٩٦٢/٢/٢٣ هێزی دیموکرات هێزی دوژمنی لە دەربەندی زاخۆ دەرکرد ناوچەی (عمادیە) بە تەواوی کەوتە دەست هێزی دیموکرات. لە ١٩٦٢/٣/١٠ لە ناوچەی (عین سفن) و (شێخان) و دێی (بریوزین) و (میرگی) و (خرمل) بوو بەشەڕ و ئەو ناوچەیە لە هێزی دوژمن خاوێن کرایەوە. لە ١٩٦٢/٣/١٤ (شێخ جەلالی بریفکان) بە فیراری دێیەکەی خۆی بەجێ هێشت. لە ١٩٦٢/٣/٢٥ (حایدە) و (منادور) کە ڕێگای ئیتصال بوو لە نێوان (عین سفن) و (ئەتروش) لە هێزی قاسم پاککرایەوە. لە ١٩٦٢/٣/١٧ فڕۆکەی بۆمباهاوێژ بۆ ڕزگارکردنی هێزی گەمارۆ دراوی (بریفکان) کەوتە بۆمبا هەڵڕشتن و لە ئاکاما (١٥٠) نەفەریان کوژرا و بریندار بوو لەگەڵ گرتنی (٩) ماشێنی جەنگی بە کەلوپەلی جەنگەوە و کوژرانی (٥) ئەفسەر لە ملازمەوە هەتا دەرەجەی عقید.

لە ناوچەی (عین سفن و شێخان) هەر لەو سەردەمەدا پاڵەوانی ناوداری ناوچەی بادینان (محمد امین ئەمیرخان) ئەندامی پارتی دیموکرات بریندار ئەکرێ بە (٣) گوللە وە بە برینداری ئەبرێ بۆ موصل، لە ڕۆژانی (١٧ و ١٩٦٢/٣/١٨) لەسەر پیلانی دائیرەی ئەمن لە مستشفی موصل بە ڕەشاش تیرەبارانی ئەکەن (١٥) گوللەی لێ ئەدەن. بە داخەوە کە قارەمانێکی ئاوا لێوەشاوە بەم شێوە دڕندانە لەناو ئەبرێ. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٣/١٨ لە ناوچەی دهۆك هێزی دیموکرات لەگەڵ مەفرەزەیەکی پۆلیس ئەکەوێتە شەڕ لە کێوی

(سنیان) بە کوژرانی یەك پۆلیس و برینداری دوو نەفەر کۆتایی بەشەڕەکە دێنن.

لە ١٩٦٢/٣/١٩ هێزی پێشمەرگە (چوارتا) ئەگرن بە کوژرانی پۆلیسێك و بریندارکردنی نەفەرێك چوارتا چۆڵ ئەکەنەوە. لەسەر ئەو ئیخبارە هێزی شورتە لەگەڵ مدیری پۆلیس لە سلێمانییەوە بە هاواری چوارتاوە ئەچن، لە پردی (تەگەران) لەگەڵ پێشمەرگە لێیان ئەبێ بە شەڕ پۆلیسێکی زۆر ئەکوژن و دە سەیارەش بە دیل ئەگرن و ئاگری (نەورۆز) بە سەیارەکەیان ئەکەنەوە. بەلاّم لەو جەنگەدا (کاك حەمید کاوانی) ڕۆڵەی قارەمان و (کاکو سەعید) بە ڕەشاشی فڕۆکە لەو ناوچەیەو هەر لەو ڕۆژەدا شەهید ئەکرێن.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٣/٢٢ مەخفەری گرگاشە ئەگرن (٢٨) پۆلیس خۆیان ئەخەنە بەر دەستی هێزی دیموکرات و هەر لەو ڕۆژەدا فڕۆکە دێهاتی (باسن) (بەردەشین) و (ئاوەکورتێ) و (کونەماسی) و (سەرسیر) بۆردومان ئەکات. لە ١٩٦٢/٣/٢٠ دا هێزی دیموکرات ئەچێتە ناو (تل خشفی سەروو) و (تل خشفی خواروو) و دێی (ئەستینك) و (دوسینکا) و، ئەو ناوچانە لە هێزی دوژمن پاك ئەکاتەوە. هەروەها دوژمن لە دێکانی (دولاّ) و (دێرە کزفیك) و (بیسفیکی) خاوێن ئەکەنەوە. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٣/٢٦ (٧٠٠) حەوت سەد کەس لە هێزی (هەرکی و سورچی) بۆ یارمەتی (شێخ جەلالی بریفکانی) ئەچن لەگەڵ پێشمەرگە ئەکەونە جەنگەوە (شێخ جەلال) بە جلی ژنانەوە دەرئەچێ.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٤/٢٠ دا بە چوار فڕۆکەی میك دێهاتی (سەرکەپکان) و ناوچەی (شاور) لە قەزای ڕانیە بۆردومان کرا تەنیا دوو نەفەر بەناوی (عەولاّی مەلا) و (نبیە شین) خەڵکی دێی (میرە بەگ) بە ساچمەی فڕۆکە بریندار کران. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٥/٦ مەرکەزی (ماوەت) گیرا پۆلیسەکان لەگەڵ معاون جلالی حاجی علی و مأموری مەرکەزەکە بە دیل گیران لە ڕۆژانی (٨ و ١٩٦٢/٥/٩) فڕۆکە دێهاتی (هەرتەل) و (زێویە) و (ئەندیك) و (ئەنگۆز) و (سارتکە)ی بۆمب بارانکرد، بەلاّم خۆشبەختانە تەنیا لە دێی (هەرتەل) چوار زەلام برینداربوون کە یەکێکیان فەڕاشی خەستەخانەی هەرتەل بوو. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٥/١٠ ماموری مەرکەزی چوارقوڕنە (نشات علی عەباس ) لە کلکەی (کۆلین) نزیك ڕانیە لە لایەن پێشەرگەوە بە دیلگیرا و برایە بارەگای بێتواتە و خرایە زیندانی (ملا ماتوڕی) ناودار بۆ تعزیبی تاوانباران و بێ تاوانان.

لە ١٩٦٢/٥/١٢ (سەید ئەحمد) ناوی موظفی صحی سەنگەسەر دەردەست کراو نێرایە بارەگای (مەلا ماتۆڕ) لە بێتواتە, بەناوی ئەوەوە کە ئەو شەخصە عەرەبی موصلە و سەر بە حیزبی بەعس بووە. هەر لەو سەروبەندەدا لەشکری (عەباس ئاغای ئاکۆ) لە ناوچەی (حافظ) لە نزیك دێی (دێگەڵە) بە سەرکردەی (حەمەدە گەورە) لەگەڵ هێزی جاشا ئەکەونە شەڕەوە. بەلاّم ئەو تاقمە کە بریتی ئەبن لە (٢٠) نەفەر ئەشکێن، بەلاّم (ڕەسوڵی عبداللە زنگلی) کوێخای (چۆڵیاوا) بە چوار نەفەرەوە بە هاواری ئەو لەشکرە شکاوە ڕائەکا، لەشکری جاشەکان بە (٤) نەفەر کوشتار ئەگێڕێتە دواوە وە ئازایەتیەکی زۆر پیاوانە لەو شەڕەدا دیاری ئەکا.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٥/١٤ فەوجی (محمود خەفاف) هاتە ڕانیە و چوو بۆ قەلاّدزێ و لە ڕۆژی ١٩٦٢/٥/١٩ ئەم فەوجە توانی (عەباس ئەفەندی) مدیری مەکتەبی ئاکۆ لە ڕانیە لەگەڵ (مغدیدی محمد خظر) میراوی ئاوی بلدیە و (غریبی مام حسن) و (حمە سێوکانی) بگرێ. وە بیانبا بۆ سلێمانی بەلاّم لە هەمان ڕۆژدا (مەجید سەعید) کە ناوبانگەکەی (مەجید گورگە)یە لەگەڵ (عەزیز صدیق بەگ) و (حسێنی حمە ئەمین) کە مەشهورە بە (حسینی حاجی طاهر) لە ترسی گرتن ئیختیفایان کرد، چونکە لەوکاتەدا ئەوانە مەسئولی حیزبی ڕانیە بوون.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٥/١٢ سەرای پێنجوین خرایە گەمارۆوە لە لایەن هێزی پێشمەرگەوە و لە ڕۆژی ١٩٦٢/٥/١٥ (ڕۆبیتەن) قائمقامی پێنجوین بە برینداری بە ناوی مفاوەزەوە هاتە



ناو ریزی پێشمەرگەوە، لە ١٩٦٢/٥/٢٠ فڕۆکەیەکی (میك) بە گولەی پێشمەرگە لە ئاقاری دێی (تەلان) ئەکەوێتە خوارەوە و (٣) ظابطی تەیارەی تیا ئەسوتێ.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٥/٢٤ لە لایەن معاونی شرطە (کمال شێخ غریب)ەوە مەرکەزی پێنجوین بە ناچاری تەسلیم پێشمەرگە کرا، دەسکەوتی پێشمەرگە بریتی بوو لە: (١١) هەزار دینار و (٦) هەزار فیشەك و (١٧٢) نەفەر پۆلیس و شەش ڕەشاش و ئەم ڕووداوە بە هونەرمەندی (حەمە ڕەشید خان) تەواو بوو، چونکە (حەمە ڕەشید خان) چووە ناو پۆلیسەکان لەسەرای پێنجوین و وادەی سەلامەتی بە پۆلیسەکان دا ئەوانیش لەسەر ئیعتیباری (حەمە ڕەشید خان) خۆیان دا بەدەستەوە، بۆ ڕزگارکردنی سەرای پێنجوین حکومەت لە ١٩٦٢/٥/٢٥ (٣) فەوج سەربازی خستە ڕێ، پێشمەرگەی قارەمان لە (ناڵپارێز) ڕێگای بە دوژمن گرت. لە هەموو لایەکەوە هێزی دوژمنیان خستە فشارەوە. (جەلال تاڵەبانی) لەو ڕۆژەدا دەورێکی زۆر دلێرانە و ئازایانەی بەکارهێنا و دەستەو دائیرەی (حەمە ڕەشید خانیش) فیداکاریەکی زۆر باشیان بەخەرج دا. بەڵام هورەی ناوخۆ (شێخ نصرەی) ناڵپارێزی بە ڕێگایەکی نەناسراو و چەپەکدا هێزی دوژمنی گەیاندە پێنجوین. بەڵام کوشتاری حکومەت لەو شەڕەدا (١٥٠) نەفەر کوژرا و (٧٠) نەفەر بریندار بوو.

بەداخەوە لە ئاکامی ئەو جەنگەدا پاڵەوانانی ناوداری مەعرەکەی کوردایەتی (ملا ڕەسوڵ گدرون) و (حەمەی چاڵەوەیس) و (صدیق شوان) و (احمد محمد شەدەڵەیی) شەهیدکران خوێنی پاکیان بەسەر شاخەکانی (ملەکەوە) و ناوچەی (ناڵپارێز) ڕژا. وە بەم پێیە ناوچەی پێنجوین گیرایەوە و (روبیتن) ئەویش بە هەڵی زانی خۆی خستبووە بەردەستی حکومەت، بەڵام بە تەعزیب و شەق کارییەکی تەواو ڕەوانەی بغدایان کرد. چونکە (کمال شێخ غریب) بە بروسکە حکومەتی ئاگادار کردبووەوە لە کاتی خۆیا کە گوایە (ڕوبیتەن) بۆتە هۆی گیرانی سەرای پێنجوین.

(شێخ نصرە)ی تاوانباریش لە سزای ئەم تاوانە لە ڕۆژی ١٩٦٢/٦/٥ لە جادەی کاوەی سلێمانی درایە بەر دەمانچە بەڵام تەنیا بریندار کرا. لە شەوی ١٩٦٢/٦/٦ هێزی پێشمەرگە ئەچنە سەر مەخفەری (ڕووباری کۆیە) پۆلیسێك ئەکوژن و دە نەفەریش بە دیل ئەگرن. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٦/٦ لۆرییەك حەیوانی عەسکەری قەڵادزێ لە دەربەندی ڕانیە گیرا. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٦/١٠ یەك لۆری ئاردی ئیعاشەی ڕانیە بەرێکرا بۆ (سەروچاوە). لە ڕۆژی ١٩٦٢/٧/١ (٤٠) پۆلیسی مەخفەری قەشقۆڵی چوونە ناو هێزی پێشمەرگەی سورداش. لەشکری ئاغایانی پشدەری بە هێزێکی (٤٠٠) نەفەری چوونە ناو لەشکری مەلا مصطفی لە ناوچەی (گەڵاڵە) و (ڕایات). لە ڕۆژی ١٩٦٢/٧/١٠ مدیری ناحیەی بنگرد (یونس) ناو بە دوو گوللە برینداركرا و وە بە فڕۆکە گوێزرایەوە.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٧/١١ مەخفەری (ڕایات) کە (٤٠) ڕۆژ بوو لەژێر گەمارۆدا بوو تەسلیم بە هێزی مەلا مصطفی بوون کە هێزەکەیان بریتی بوو لە (٨٣) پۆلیسی مەحەڵی تەنیا مدیری ناحیە و معاونەکەیان لەگەڵ (کریم خۆرانی) باش چاوەش گلدرایەوە پۆلیسەکانیان هەموو ئازاد کردن، بەڵام (مەلا ماتۆڕ) لە بێتواتە ئەو (کریم خۆرانیە) لە زیندانا ئەکوژێ، چونکە ئەو کەریم ناوە زۆر ئازا ئەبێ مەلا مصطفی لەسەر کوشتنی ئەو (کریم خۆرانیە) عاجز ئەبێ. تەسلیم بوونی ئەو مەخفەرە بەهۆی لوغمەوە ئەبێ لە ژێرەوە خەندەقێك لێ ئەدەن لەناو (سەراکە) سەر وەدەرئەنێ.

لە لایەن دادگای عسکری عورفی دووهەم لە ١٩٦٢/٦/١٤ محامی (عبدالجباری پیرۆزخان) و (معروف بەرزنجی) و (حسن بەرزنجی) و ڕەئیس متقاعید (فاتح جباری) و (کاك نوری مەلا عبدالله) و (کاك مجید حسن) ئەمری خنکاندنیان بۆ دەرچوو هەروەها پێنج ساڵ حوکمی زیندانی درا بەسەر (حمە علی عمری فلاح) و کاك (عبدالوهاب قنبر) و (رئیس داود العانی) و دوو ساڵ بەندی درا بەسەر عقید (ئەسعد بابان) و رئیس (فەوزی سنەوی) و محامی (مصطفی العسکری) و مقدم (کمال عبدالمجید) بە تاوانی ئەوەی کە لە ڕۆژی (١٤ هەتا ١٧/تەموزی/١٩٥٩) ئیشتراکی کوشتن و ڕاکێشانی تورکمانەکانی کەرکوکیان کردووە و حادیسەی کەرکوك بە پەنجەی ئەوانە هاتۆتە وجودەوە.

## جوڵانەوەی پۆلیس

ڕۆژی ١٩٦٢/٧/٢٠ (خولە ئامە) ڕەئیس عورەفای غیر نیزامی لە مەخفەری (گەناو) چووە ناو هێزی پێشمەرگە، وە لەهەمان ڕۆژ (٨) نەفەری تر لەپۆلیسی قەڵادزێ چونە ناو هێزی پێشمەرگە. لەڕۆژی ١٩٦٢/٧/٢١ معاونی پۆلیسی سەیار (جمعە) ناو لەلایەنی مەسئولی حزبی ڕانیە (مجید گورگە) وە دەست بەست کرا و نێررایە دار التعزیبی (بێتواتە). لەشەوی ١٩٦٢/٧/٢٤ هێزی سەرای سەنگەسەر تەسلیم بە پێشمەرگەی کوردستان بوون. کە بریتی بوون لە (١٠) نەفەری پۆلیس و مدیر ناحیە (تایە بعونە) ی عارەب و (محمد امین) ناوی مأمور مرکز، ئەوان هەموو بە دیلی برانە بێتواتە، گیرانی ناوچەی سەنگەسەر بە هونەری (مجید گورگ) و (عەزیزی صدیق بەگ) و (ڕەسوە سورە) و (عەریف حسین) و (حمە لاوی) پۆلیس پێکهات.

هەر لەو ڕۆژانەدا ناحیەی (سیدەکان) یش تەسلیم بە هێزی پێشمەرگە کرا و دێی (لولان) یش سوتێندرا. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٧/٢٨ پۆلیسی مەرکەزی دوکان بە هێزێکی (٣٥) نەفەری چوونە ناو هێزی پێشمەرگە لەبەر ئەوەی کە پۆلیسە پیسەکان لەگەڵ ئەو (٣٥) نەفەرە خاوێنە ئەجەنگێن و هێزی عەسکەریش بە قوەتێکی (٢٠٠) نەفەری بە هاواری پۆلیسە پیسەکان ڕائەگەن. ئەو (٣٥) نەفەرە ناتوانن لە

فراری خۆیان هیچ دەستێکی تر لە معاون و مأمور مرکز و مدیر ناحیە بوەشێنن. لەرۆژی ١٩٦٢/٧/٢٨ پۆلیسی ناحیەی بنگرد بە مەوجودێکی (١٤) نەفەریەوە بە هونەرمەندی پۆلیس (سلیم خدر مەنگوڕی) بە فێڵێکی جوان مأمور مەرکەزەکەیان (علی عثمان) ناو ئەگرن وە بەهەموو زەخیرەیەکی پۆلیسەوە ئەچن بۆ (بێتواتە) پۆلیسی ناحیەی (ڕادار) یش هەر لەو ڕۆژانەدا چوونە ناو هێزی پێشمەرگەوە لە لیوای کەرکوك. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٧/٣١ (عبدالله خدر مەنگوڕی) ناوی پۆلیسی ڕانیە لەگەڵ (خدر) ناوی پۆلیسا هەردووکیان بە چەکەوە چوونە ناو هێزی پێشمەرگە. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٨/٣ دوانزە ئەفسەری پۆلیسی چوارقوڕنە بە چەکەوە چوونە ناو هێزی پێشمەرگە.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٧/٢ (زکی) ناوی موصلی کە جوندی متطوع بوو لە ڕێگای (هیزۆپ) گیرا و برایە بێتواتە. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٨/٦ خەبەر وەرگیرا کە فەوجی (٢) لوا (٢٠) دێ بۆ ڕانیە. حیزبییەکان دەستیانکرد بە تێکدانی ڕێگاکان چەند خەندەقێکی گەورەیان لەسەر ڕێگای دەبابە هەڵکەند. وە ئەو کەسانەی بە فەرمانی حیزبی ڕانەگەیشتن بۆی چوونە شاخەکان (مەجید گورگە) و (عەلی حەسن ڕەزا) و (عەزیز صدیق بگ) و (شێخ حەمید) و (حسین حمە امین) و (سەید قادر) و (مەلا فاتیح) و (سەعید خورشید بیکال) و (توفیق حاجی طاهر دەڵاك) و (صالح مصطفی عەطار) و (مام ڕەسول کاکە ئەمین) و (حەمە لاوی فەراش) و (حەمەدی برایم میرزا روستەمی) و (حەمەی وەستا حسن) و (عەلی عایشە رانکی) و (فەرج محەمەدی دوکاندار) و (قادری کوێخا وسو) و (قادری احمد طاوی) و (صدیق خیاط) لەگەڵ چەند شاگردێکی مدرسەدا. لەناو شاخەکانی (کێوەڕەش) و (میرەبەگ) و (حاجیلە) و (خەلەکان) و (دەربەندی ڕانیە) ڕێ بەندانیان داهێنا. هەر لەو ڕۆژانەدا مەلا مصطفی بە لەشکرێکی زۆرەوە هاتە ناوچەی (باڵەکان) ڕێگای ڕەواندزی داخست.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٨/٨ دا (حمە ئاغای عبدالرحمن ئاغا) ی سلێمانی کە زۆر دڵسۆز بوو بەم شۆڕشە وەفاتی کرد پێش ئەوەی مستەقبەلی ئەم شۆڕشە ببینێ. حکومەتی سلێمانی (حەمە ئاغا) ئەگرێ و بروسکەیەکی تەبریکاتی بوردومانی ڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ بۆ ئەبەن بۆ زیندان تا ئیمزای بکات, تا بەرەڵای بکەن. (حمە ئاغا)ش بروسکەکە ئەدڕێنێ و ئەڵێ من ئەو زیندانە بە شتێکی بەشەرەف ئەزانم کە لە پێناوی گەلەکەی خۆما گیراوم. من چۆن دڵ و دەروونم بڕیار ئەدا کە بڵێم عبدالکریم قاسم دەستت خۆش بێ کەوا بە فڕۆکە ڕاوی گەلەکەم ئەکەیت.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٨/٨ دا فەوجی (٢) لوا (٢٠) لە ژێر فەرماندەی (عبدالغنی ئیبراهیم) بە سام و تەوژمێکەوە گەیشتە ڕانیە. لە هەموو لایەکەوە دەستکرا بە تەعزیب و ماڵ پشکنین. بە ئەندازەیەك ترس و سامی لەشکری دوژمن بە خەڵك نیشتبوو کەس بە هیوای ڕزگاری خۆی نەبوو. لەم کاتە مەترسیەشدا پیاوەکانی میری لە وێنەی (محمود) و (صوفی) و (احمد-فراشی مالیە) و (سالح) کە دەستیان دابووە خراپەکردن و ڕاپۆرت دان. بە ناوی علاقەداری شۆڕشەوە (عبدالرزاق محمود-کاتبی مالیە) و (حمە لاو-فراشی قایمقام) و (قادری مام ئاغا) و (حاجی هەمزە) و زۆر کەسی تریان گرت.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٨/١٣ دەستکرا بە پشکنینی ماڵان لە ماڵی (مەلا فاتیحی ڕەسام) ئەندامی حیزبی ڕانیە ئەوراقی حزبیان لێ دۆزیەوە. ئەوانەی کە ناویان لەو دەفتەرەدا بوو یا هەڵاتن یان گیران. لەو ناوانە (ئاسۆس میرزا مەنگوری) کە لەبەشی کچانی دەبوستان علاقەداری ئافرەتان بوو لەگەڵ (گەلاوێژ شەفیق) و کچی (خاڵە سعدالدین) ناویان دۆزرایەوە خۆیان شاردەوە. بە ڕێگای کۆیەدا چوونە سلێمانی، شاری ڕانیە لەبەر ڕاپۆرتکاری پیاوە پیسەکانی ناو ڕانیە پەردەیەکی ڕەشی بە سامی بەسەرا هەڵکێش را بوو.

هەر لەو سەروبەندەدا لە ژێر قیادەی (مام جەلال تاڵەبانی) لە ڕێگای (کۆتەڵی سورداش) پەلاماری هێزی پۆلیس ئەدەن (١٢) پۆلیس ئەکوژرێ و (٣) سەیارەی مسەلەحەیش ئەسوتێنن. بەڵام لە هەمان ڕۆژا بەو ڕێگایەدا کوڕی (حمەی محی الدین) ناو و سائیقێك ئەچن بۆ سلێمانی. جەیش ئەیانگرێ و تیرە بارانیان ئەکات. ڕۆژی ١٩٦٢/٨/٢٠ لە سلێمانی (صلاح) ناوێ لەبەر جاسوسی کوژرا و (عەزیزی نانەوای) ڕانیە بە تۆمەتی جاسوسی و برایە بێتواتە. سلێمانی و قەڵادزە بەرامبەر بە جاسوسی و پیاو خراپەکانی گەل کەوتنە تێکۆشان و هیمەت نواندن چین بە چین کۆیان ئەکردنەوە و بۆ لای مەلا عبداللە ماتوڕ بەڕێ ئەکران بۆ بێتواتە بۆ تعزیب, موجودی جاسوس و جاش پۆلیس لە زیندانی مەلا عبداللە گەیشتبووە (٤٠٠) نەفەر.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٩/٥ لەسەر ئیخباری (عەزیز) ناوێ کە جاسوس بوو بە چەند پیاوێکی چەپەڵی سەر بە حکومەت لە ڕانیە گیرام, بە تاوانی ئەوەی کە گوایا ووتومە هەر کەسێك ناموسی هەبێ لەسەر دۆشەك نانوێ هەتا برا پێشمەرگەکانی بەشاخەوە بێ. گوایە بە شیعر لە کۆبونەوەیەکی گشتی وام وتبێ. ضابطی ئیستخباراتی عەسکەری و قائیمقامی ڕانیە و معاونی شورتە بۆ ئەو باسە ئیستجوابیان کردم. بەڵام لەبەر ئەوەی کە ڕاپۆرتەکە ڕاستی نەئەکرد لەسەر شێوەیەکی زانایانە نەنوسرابوو من بەرەڵا کرام (عەزیز) چوار مانگ لە تەوقیفدا مایەوە هەتا نەبوو بەجاش پۆلیس بەرەڵا نەکرا.

لە ڕۆژی ١٩٦٢/٩/٢١ لە لایەن (محمد شێخ عبدالکریم کریچنەیی) مەرکەزی ناحیەی قەرەداغ گیراو (٧٥) تفەنگ و (٢) ڕەشاش و (٢٠٠٠) فیشەك و (٣) دەمانچە و جیهازێکی لاسلکی یان دەستکەوت بەڵام (عواد کاظم) ناوی مأمور مەرکەزەکەیان بەرەڵا کرد، چونکە عەرەب بوو. خراپە کردنەکەی لێ بە تاوان نەگیرا. چونکە لەسەر وەزیفەی عەرەبی خۆی ئەم تێکۆشانەی کردبوو. هەر لەم ڕۆژانەدا لەسەر ئەمری (زعیم صدیق مصطفی) امر لوای (٢٠)

هەموو دێهاتی ناوچەی (خەلەکان و عەربەت و سورداش و قەرەداغ و بازیان) یان سوتاند کە بریتی بوون لە دێی (کوکان، بیّ دازان، دولکان، تیمار، خوردەلوکی سەرو خوارو، هۆمەر قەوم، چالاّغ، سابورئاوا، کانی میران، موغاغ، سوسیّ سیدان، سوسی ئالەمەڕ، چەرمەگا، قازی ئاوان، یالاّنقۆز، بازیان، بی بی جەگ، کلاّش کەران، (اللهی حق)، گۆپالّە، باینجان، لازیان، دەرگەزێن، کانی مازو،کانی وەتمان، شوشکە، ئالیقە، باقلان و خەلەکان) لە ناوچەی خەلەکان کوشتارێکی زۆریان لە خەلّکیّ کردبوو چل کەسیشیان لیّ گرتبوون.

لە شەوی (١١ و ١٩٦٢/٨/١٢) مەرکەزی تەق تەق گیرا، (٦٥) تفەنگی سەمینوف و هەشتا تفەنگی ئینگلیزی لەگەلّ دوو تۆپی هاوەن و دوانزە تفەنگی ی کلانشیکۆف و حەڤدە دەمانچەی ڕوسی و حەوت هەزار فیشەك و، مأمور مەرکەزەکەی لەگەلّ چواردە پۆلیس چوونە ناو پێشمەرگە. هەر لەم ڕۆژانەدا مەرکەزی قەزای چوارتا گیرا، بیست پۆلیسی تیا بەدیل گیرا، لەگەلّ بیست و یەك تفەنگی ئینگلیزی و شەست تفەنگی ڕوسی و پەنجا غەدارە و کلانشیکۆف و سیّ ڕەشاشی ئەکتارنۆف و بیست ڕەشاشی بێرن و یەك هاوەن و دوو دەمانچەی بیلی و سیّ دەمانچەی تەنویر و پێنج سندوق فیشەکی تیسا گیراو، دوو پۆلیس لەم ڕووداوەدا کوژران و (عبدالوهاب ئەتروشی) مەعاونی پۆلیس چووە ناو پێشمەرگە.

لە ناوچەی ئاغجەلەر لە ژێر فەرماندەی مام جەلال تالّەبانی لەگەلّ هێزی حکومەتدا، شەڕێکی چەند کەڕەتی داگیرسا. لە ئاکاما هێزی حکومەت شکا. عەقید مەحمود عبداللە الحیالی و محمد عزاوی ظابط، لەگەلّ چەند عەسکەرێك گیران و، کوشتاری عەسکەریش زۆر بوو. شەش پێشمەرگەش لەو شەڕانەدا شەهید کران. شێخ عەزیزی شێخ فەتاح و محمد عەلی عەودالاّنی گیانی پاکیان بە ڕزگاری کوردستان بەخشی. مەحمود کاوانی کە ڕۆلّەیەکی زۆر قارەمانی شۆڕشی دیموکراتی کوردستان بوو بە گوللەی فڕۆکەیەك لە ناوچەی شەقلاّوە لە شەڕی سەفیندا گیانی پاکی بە کوردستان بەخشی.

لەڕۆژی (١٩٦٢/١٠/١٧) فەوجی لیوای (٧٢) هاتە ڕانیە، ئەوانیش دەستیان کرد بە ئازار و ئەشکەنجەدانی دانیشتوان و دێی (شێخ ئاجیان) لە خەلەکان سووتاند، چەند ژن و منالّێك تیا چوون.
هەر لەو ڕۆژانەدا مەلا مستەفا سەرکردەی شۆڕش گەیشتە دۆلّی شاوور و بێتواتە. لە هەموو لایەکەوە حکومەت حصاری ئابووری لەوناوە نایەوە نرخی تەنەکەی نەوت گەیشتە یەك دینار و پێنج سەد فلس، کارەبای شارەکان لەبەر نەهاتنی سووتەمەنی لە کار وەستان. لە هەموو لایەك عەشایر و پێشمەرگە پالّیدایە یەك و بە یەك دەنگ یا مردن یا ئازادی کەوتنە بەرەنگاری دوژمن. بە تایبەتی جەلال تالّەبانی لەو سەروبەندەدا، زۆر دەوری ئازایانەی ئەگێڕا، لە هەموو شەڕێکدا سەرکەوتوو بوو، لە ناوچەکانی (سسورداش، قەرەداغ، ئاغجەلەر، چوارتا و پێنجوین) دا، ناوێکی بەرزی بەم هونەرمەندایەتیەی وەرگرتبوو.

عەباسی مەمەند ئاغاش، ناوێکی زۆر بەرز و پیاوانەی وەرگرتبوو، کەوا دەستی لە هەموو خۆشی و ڕابواردنی خۆی هەلّگرتبوو، وازی لە هەموو دێهات و واریدات هێنابوو، خۆی خزاندبووە ناو ئەشکەوتەکانی دۆلّی شاوور و، شان بەشانی پێشمەرگەیەکی ڕەبەن ئەجەنگا. بەم پێیە لە نێوان پێشمەرگە و هێزی قاسما جەنگ کوردستانی ئەگەچلاّن و، هەموو عێراق بە ئازاری جەنگەوە ئەینالاّند، باری ئابووری ولاّت لە هەموو لایەکەوە ڕووی کردە ناخۆشی و هەژاری. هێزی پێشمەرگە، مەکتەبی سیاسیان بردە گوندی (مالومە) ی ناوچەی ماوەت، چەمی (ڕەزان) کرا بە جێگای مەکودانی لەشکر و کاروباری گرنگی حیزبی و ڕۆژ بە ڕۆژ هێزی پێشمەرگە ئەبوژایەوە و، هێزی قاسم بەرەو توانەوە ئەڕۆیشتن. لە ١٩٦٢/١١/٣ (سلیمان نەبیە شەلی بۆلّیّ) لە (گەرویّ) ی بەشی ناوچەی سیدەکان کە ڕۆلّێکی زۆر ئازاو هەلّکەوتوو بوو، لەگەلّ(کەریم خانی برادۆست) بە شەڕ هات و کوژرا.

کەریم خان زۆر فیداکار بوو بۆ مەلا مستەفا، لەو سەروبەندەی کە بارزانیەکان لە ڕوسیا ئەبن، ناوی یەکێك لە بارزانیەکان بە کوژراو دێتەوە. ژنی ئەو بارزانیە شوو ئەکاتە بە پیاوێکی کەریم خان. کاتێك مەلا مستەفاو بارزانیەکان ئەگەڕێنەوە بۆ عێراق، کابرای بارزانی لای مەلا مستەفا شکایەت ئەکات بۆ ژنەکەی. کەریم خان داوا لە مەلا مستەفا دەکات کە وەسلّەت بۆ پیاوەکەی بکات، چەندی لیّ بستێنن بۆی ئەدا، بەلاّم مەلا مستەفا ئەلّیّ: ئەبیّ کابرا هەر بکوژریّ، چونکە نابیّ ژنە بارزانی ئاوایان بەسەربیّ. لە ئەنجامدا پیاوەکە و ژنەکە ئەکوژن و کەریم خانیش لەسەر ئەوە هەلّئەگەڕێتەوەو ئەچێتە لای حکومەت و ئەبیّ بە فرسان. یەکەمین خراپەکردنی ئەوە بوو کە سلێمانی نەبیە شەلی کوشت، لە کاتێکدا سلێمان زۆر دۆستی مەلا مستەفا بوو زۆر کوڕێکی ئازاش بوو.

## ئینقلابی عەبدوسەلام عارف و کوژرانی عەبدولکەریم قاسم

ڕۆژی ١٩٦٣/٢/٨ کە ڕێکەوتی (١٤ ڕەمەزانی ١٣٨٢.هـ) ئەکرد، عەبدوسەلام عارف کە لە زیندان ئازاد کرابووەوە لە مالّی خۆی دەست بەسەربوو، لە ژێرەوە لەگەلّ دەستەیەك سەرباز یەك ئەگریّ و، لەو ڕۆژەدا ئینقلاب ئەکات (عبدالکریم قاسم، عەباس مهداوی، وصفی طاهر، احمد شێخ طە، ماجد محمد امین و داود سلیمان جنابی) لەگەلّ زۆر ظابط و سەرباز ئەکوژرێن، لە حەرەسی قەومی و منظماتی حزبی شیوعی کە لەسەر عبدالکریم قاسم، بەرگری ئەکەن،

لە ئەنجامدا کوشتاری زۆر لە ژن و پیاو ئەکرێ. وە ئەو کەسانەی کە پەیوەندیان بە دۆستایەتی عبدالکریم قاسم هەبووە، بە زۆری خۆیان شاردەوەو ڕوویان کردە لای مەلا مستەفا.

لەو کاتەدا فوئاد عارف و صالح یوسفی کە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حزبی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، بروسکەی تەئیدیان بەناوی حزبەوە نووسی و تەئیدی هەڵوێستی (عەبدوسەلام) یان کرد، بەو مەرجەی کە لەگەڵ کوردەکان ڕێگایەکی ئاشتی و دۆستانە بگرێتە بەرچاو. لە ڕۆژی (١٩٦٣/٢/٩) دا حکومەتی سەلام بڕیاری نەهێشتنی شیوعیەکانی بلاوکردەوە. لیژنەی مەرکەزی شیوعی بە هەموو ئەندام و سجلاتیانەوە گیران، لە هەموو لایەکەوە دەستکرا بە کۆکردنەوەیان و سکرتێری حزبی شیوعی (سلام عادل) ئیعدام کرا، لە هەمان کاتدا عەبدوسەلام عارف دەرگای یەکێتی لەگەڵ میسر و یەکێتی عەرەبی خستە سەر پشت. لەگەڵ کوردەکانیشدا دەرگای مفاوەزەی کردەوە، جەلال تاڵەبانی لەگەڵ وەفدێکی عێراقیدا چوون بۆ (میسر و جەزائیر) لەوێ بەسەرهاتی کوردیان بە جمال عبدالناصر و احمد بن بله گێڕایەوە.

لە ڕۆژی ١٩٦٣/٣/٤ ئەحمەد حەسن بەکر سەرۆکی وەزیران و طاهر یحیی سەرۆکی ئەرکانی سوپا و فوئاد عارف وەزیری دەوڵەت و چەند مەئمورێکی گەورەی تری عێراق بۆ چاوپێکەوتنی مەلا مستەفا هاتنە (قۆپی کانی ماران) لە قەزای ڕانیە و، ڕێکەوتن لە نێوانی مەلا مستەفا و عبدالسلام عارف پێکهات. لە ڕۆژی ١٩٦٣/٣/٨ دا لە لایەن (مەجلس وەتەنی قیادەی سەورە) بەیانێك بلاوکرایەوە کە حکومەتی عێراق شکلێکی لامەرکەزی بۆ میللەتی کورد لە عێراق پێك دێنێ. ئەو وەفدەی کە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ مەلا مستەفا هاتبوونە چوار قوڕنە پێکهاتبوون لە: (رضا شبیبی، حسێن جەمیل، فایەق سامەرائی، فیصل حەبیب خەیزەران، زەید ئەحمەد عثمان و عەبدولعەزیز دوری). لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕشی کورد گفتووگۆیان کرد، ئەم وەفدە ناویان نابوو (وەفدی میللی). هەر لەو ڕۆژانەدا حەبیب خەیزەران لەگەڵ وەفدێکی میللی عەرەبی بە فرۆکە هاتنە چوارقوڕنە چاویان بە مەلا مستەفا و مام جەلال و کاربەدەستانی شۆڕش کەوت لەسەر لامەرکەزیەتی کورد بڕیار درا.

لە ڕۆژی (١٩٦٣/٣/١٩) هەتا (١٩٦٣/٣/٢٣) لە شاری کۆیە کۆبونەوەیەك لەگەڵ هەموو چینەکانی کورد کرا، لە ئاکامی ڕای گشتی دا، بڕیاری لامەرکەزیەتەکەیان بە چوارده مادده ڕێك خست لەوانە:

١-نیوەی داهاتی نەوت بدرێ بە کورد.

٢-مەرکەزی کورد لە خەتی جەبەل حەمرینەوە دەست نیشان بکرێ.

٣-لە کەرکوك لیژنەیەك بۆ سەرپەرشتی کاروباری کورد دابنیشێ.

٤-سەربازو پۆلیس و کاربەدەستانی ئیداری هەموو کورد بن.

٥-هەموو وەزارەتێکی عێراق، معاون وەزیرێکی کوردی هەبێ.

٦-زمانی کوردی بە ڕەسمی دابنرێ، هەتا لە کولییەکانی زانکۆدا دەرسێك کوردی بێ.

جا بەم گوێرەیە ڕەزامەندی لە هەموو چینێکی عەشایەر و شارستانی وەرگیرا. ڕۆژی (١٩٦٣/٣/٣٠) مام جەلال بە سەرۆکایەتیی وەفدێك لەگەڵ مەسعودی مەلا مستەفاو چەند ئەندامێکی تر، ئەو مزەکەرەیان برد بۆ بەغدا، لە هەموو لایەکەوە شەڕ ڕاگیرا. لە لایەن حیزبی دیموکراتی کوردستان و حکومەت دەستکرا بە ئازادکردنی زیندانیەکان. مەلا مستەفا (٨٥٠) دیلی لە ئەفسەر و سەرباز و پۆلیس ئازاد کرد، حکومەتیش کە نزیکەی (٥) هەزار کەسی لە هەولێر، کرکوك، موسڵ، بەغدا، نقرە سلمان، جبایش و سن زبان بە دیل گرتبوو، ئازادی کردن.

ڕۆژی ١٩٦٣/٤/٨ جەلال تاڵەبانی مزەکەرەکەی دا بەسەرۆك وەزیرانی عێراق و جەلال تاڵەبانیش ئەو چەند پێشنیارەی خۆی خستە سەر مزەکەرەکە، چونکە حکومەتی عێراق ئەیویست لەم سەروبەندەدا، لەگەڵ حکومەتی میسر و سوریە یەکێتی عەرەبی پێك بێنێ.

### ماددەکانی مام جەلال ئەمانە بوون:

١-هەر وەختێك عێراق لەگەڵ سوریە و میسر یەکێتی کۆمارییان بەست، شکلی عێراق خرایە سەر باری (قطری)، کورد بۆی هەبێ داوای حوکمی زاتی و جیابوونەوە بکات و بە لامەرکەزیەت ڕازی نەبێ، کوردیش لەم وەختەدا بە شکلی ئیقلیمی (چوارەم) بە سەربەخۆیەتی خۆی دێتە ناو یەکێتی عەرەبی و کۆماری یەکگرتوو.

٢-کورد هەر هێندە بە لامەرکەزیەت ڕازییە کە عێراق سەربەخۆ بێ و پەیوەندی یەکێتی لەگەڵ میسردا نەبەستێ.

لە ١٩٦٣/٤/١٧ دا یەکێتی عەرەبی لە نێوان میسر و سوریە و عێراق ڕاگەیەنرا، هەر سێ حکومەت خۆیان خستە ژێر باڵی میسرەوە لە ڕووی سیاسی و سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و بەیانی هاوبەش بەناوی هەر سێ حکومەت دەرچوو. عێراق کەوتە سەرباری قطری، بە مەرجێ هەتا ئەیلولی ١٩٦٣ پێویستی ئەم یەکێتییە تەواو بکرێ.

ڕێکەوتنی میسر و سوریە و عێراق، بەسەرهاتی کورد ڕێکەوتنەکەی پاش خست، ئەو وەفدەی کە چووبوون بۆ مزەکەرەی لامەرکەزیەت هەر لە بەغدا مانەوە، لە هەموو کوردستان چاوەڕوانی ڕێکەوتنی حکومەت و پێشمەرگەیان ئەکرد. لەو سەروبەندەدا بروسکەیەك لە لایەن مقدم عەزیز عەقراوی فەرماندەی هێزی دیموکرات درا بە (سعید ئاغا شینە) کە بچێتە ناو هێزی کوردستانەوە تا لەو سوپایە بدات کە لەناویەتی. حکومەتی عێراق

ئەم بروسکەیەیان وەرگرت و بەسەر هەموو هێزەکانی حکومەتدا بڵاوکرایەوە بۆ وریابوونەوە. ڕانیەو قەڵادزێ لە ڕۆژانی (٧ و ١٩٦٣/٥/٨) لە هێزی سەربازی پاك بووە و، حیزبییەکان بارەگایان لەو ناوچانە کردەوە و فەرمانی گەورەیان بەڕێوە ئەبرد.

لە ١٩٦٣/٤/٨ دا جەلال تاڵەبانی مذەکەرەیەکی دا بە سەرۆك و ئەندامانی وەفدی عێراق لە گفتوگۆکردنی قاهیرەدا. هەر کاتێك عێراق لەسەر بڕیاری خۆی مایەوەوهیچ گۆڕانێکی لە کیانی خۆیدا پێك نەهێنا لە تێکەڵ بوونی یەکێتی نەتەوەی یەکگرتووی عەرەبی و پەیمانی قاهیرە. کوردیش:

١-ئەو داواکردنەی ئەوەی کە لەبەیانی سەرکۆماری عێراق بڵاوکراوەتەوە لەسەر بنچی لامەرکەزی کورد لەگەڵ عەرەبی عێراقدا ئەژی.

٢-ئەگەر هاتوو عێراق بەشداربوو لە یەکێتی (فیدراڵی) پێویستە نەتەوەی کوردی عێراق حوکمی زاتی بدرێتێ، بەبێ هیچ دەسکاریەکی ئەو حوکمە.

٣-ئەگەر هاتوو عێراق چووە ناو یەکیەتییەکی تەواوە لەگەڵ دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی عەرەبدا، کوردی عێراق ئەبێ ناوچەیەك پێك بێنێ (اقلیم-قطر) لەو ناوچانەی کە ئەو یەکێتیەی لێ پێکدێ.

جەلال تاڵەبانی-کە نوماینەدەی مزەکەرەی نێوانی کورد و حکومەت بوو، هیچ ئەنجامێکی لەو مزەکەرەیە چنگ نەکەوت و مەودایەکی زۆریش لە بەغدا و بەیروت و دیمەشق و قاهیرە مایەوە. حکومەتی عێراقیش فەرمانی گرتنی وەفدی مزەکەرەکەی دەرکرد. شاخەوان، صالح یوسفی، مەسعود، بابکری مەحمودی حاجی ئاغا و سەید حەسنی خانەقا بە دیل گیران هەتا ١٩٦٣/٧/١٤ هەر لە زینداندا مانەوە. مام جەلالیش لە بەیروتەوە چوو بۆ نەمسا و فەرەنسا و، چەند مانگێك لە فەرەنسا و ئەڵمانیا و لەندەن مایەوە. لە هەموو شوێنێکی سیاسیدا بە سەرهاتی کورد و خراپەی عێراقی بڵاوئەکردەوە.

درۆیەکانی حکومەتی عێراقی ڕەت ئەکردەوە. زۆر هەوڵی دا کە بچێتە (سازمانی نەتەوە یەکگرتووەکان) بۆ تۆمارکردنی ئاواتی کورد و، نیشاندانی بێ ویژدانی حکومەتی عێراق بەرامبەر بە کورد، بەڵام (سازمانی نەتەوە یەکگرتووەکان) ئەو ڕێگایەی نەدایێ کە بتوانێ سەربەستانە ئاواتی خۆی پێشکەش بە سکرتاریەتی سازمان بکات. ئەمجا لە پاش چەند مانگێك مانەوە لە ئەوروپا، بە ناکامی گەڕایەوە بۆ عێراق، بۆ ناو قەسابخانەی کوشتار و، بۆ ناو ئەو پێشمەرگە شێرانەی کە لەسەر ڕێگای تانك و دەبابە و تۆپ و فڕۆکە ڕادەوەستان و، گیانی خۆیان کردبوو بە بارمتەی ئازارەکانی کوردستان. سەرلەنوێ لە نێوانی پێشمەرگە و حکومەت لەناوچەی (مەخمور، ئەزمەڕ، سپیلك، ڕواندوز، مێرگەسوور، میران، چەمچەماڵ و دبس) پەلاماری هێزی دەوڵەتی درا.

لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/١٠ دا حکومەت بەیانی ژمارە (١و١٣)ی بڵاوکردەوە کە (شمال) ناوچەیەکی جموجۆڵی سەربازیە، مەلا مستەفا و دەستەکەی ئەبێ هەتا (٢٤) سەعات چەك فڕێ بدەن و



خۆیان بخەنە بەردەستی حکومەت. لە هەمان ڕۆژدا حکومەتی عەبدوسەلام بڵاوی کردەوە، هەرکەسێ مەلا مستەفا بکوژێ (١٠٠) هەزار دیناری بەخشیش ئەدرێتێ. حکومەت لە پێش ئینزاری ناوبراوا دەستی کرد بە گرتن و کوشت و کوشتاری خەڵك لە شارەکاندا. بە هۆی تۆپ و بۆمبای ناپاڵم دەستکرا بە سوتانی دێهاتەکان.

## خوێن ڕشتنی ١٩٦٣/٦/١١

لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/١١ دا فڕۆکەکانی عەبدوسەلام هەموو ناوچەی شاوور و بێتواتە و بیتوێنیان بۆردومان کرد، لە ڕانیە ٢٧ سەر ڕەشە ووڵاخی لە گاڕانی ڕانیەدا کوشت لەگەڵ گاوان (مام قادر) ناوێك. کە ڕۆژی پێشتر (٦/١٠) ڕانیە و قەڵادزێ و کۆیە چۆڵکران، دانیشتوانەکەیان لە ترسی بۆمبارانی فڕۆکەکانی حکومەت هەموویان ڕوویان کردە شاخەکان. لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/١١ دا لە ژێر فەرماندەی عومەر دەبابەدا، سەرای حکومەتی لە کۆیە گیرا. لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/١٢ دا جەلال تاڵەبانی بۆ جاری دووەم چووەوە بۆ ئەوروپا و لە پاریس چاوی بە کامەران بەدرخان کەوت. پێکەوە داوایان گەیاندە سکرتاریەتی نەتەوە یەکگرتووەکان کە سنورێك بۆ زیادەڕۆی دڕندانەی عێراق دابنێ کە لەگەڵ کوردەکان بە ئەنجامی ئەگەیەنێ.

باسی کورد لە هەموو لایەکەوە بوو بەسەردێری ڕۆژنامەکانی جیهان، لەو ڕۆژانەدا سوپای حکومەت بۆ گرتنەوەی هەولێر و کەرکوك و کۆیە کەوتنە جوڵان. فەرماندەی هێزی پێشمەرگە (عومەر مستەفا و مەلا ماتۆڕ) لە ناوچەکانی (شیوەسوور، دێگەڵە) ڕێگەیان

بە هێزی دوژمن گرت. بەرامبەر بە تۆپ و دەبابە ڕاوەستان، جەرگی قارەمانانەی پێشمەرگە بە پێداویستییەکی جەنگی کەمەوە، ئەو هێزە زۆرەی حکومەتیان لە ڕێگاکاندا قەتیس کرد. لە هەمان ڕۆژدا فەوجێك سەربازی میری لە سلێمانییەوە بۆ پاکردنەوەی ڕێگاکان و سوك کردنی ئەو هێزەی کە لەدژی پێشمەرگەکانی (عومەر دەبابە و مەلا عبداللە) شەڕیان دەکرد بەرەو ڕانیە کەوتنە ڕێ. بەلاّم پێشمەرگە قارەمانەکان ئەو هێزەیان بە کوشتارێکی زۆر گەڕاندەوە بۆ سلێمانی.

هەر لەو ڕۆژانەدا هێزێکی گەورەی دوژمن بە یارمەتی تۆپ و دەبابە و فڕۆکەی شەڕکەر بەرەو چوارتا کەوتەڕێ. بەلاّم پێشمەرگە پاڵەوانەکان لە لۆفەکانی ئەزمەڕ هێزی دوژمنیان دایەبەر هێرشی گوللە، لەپاش بەربەرەکانی چەند سەعاتێ هێزی دوژمن بە کوژرانی (١٢٠) سەرباز گەڕایەوە بۆ سلێمانی. لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/١٠ هێزی پێشمەرگە لە هاوینە هەواری صەلاحەدین ڕێگا بە دوژمن ئەگرێ، بە شکانی (١٦) ئوتۆمبێل و کوژرانی چەند سەربازێك ئەگەڕێتەوە بۆ دواوە. ڕۆژی ١٩٦٣/٦/١٠زەعیم صدیقی خوێنڕێژ بەیانێکی بلاّوکردەوە، کە هیچ کەس نابێ هاتووچۆی دەرەوە بکات. گەڕان لە هەموو شاری سلێمانیدا قەدەغەکرا، لە شەوی ١٩٦٣/٦/١١ دا دەستی کرد بە کۆکردنەوەی دانیشتوانی شاری سلێمانی. نزیکەی چوار هەزار کەسی کۆکردەوە و، نزیکەی (٣٠٠) کەسی بەبێ پرسیاری دادگا کوشت و باقی دیلەکانی تریش بە لێدان هەموو ئەندامیان ئەشکێنن، چ جای ئەوەی لەناو تەویلەی وولاّخ و جێگای پیس، بۆ مەودای دوو مانگ ئەشکەنجەیان ئەدەن.

ئەم ڕووداوە خوێنڕێژییە بوو بەهۆی ئەوەی کە زۆربەی خانەوادەی سلێمانی ڕووبکەنە ناوچەی شارباژێڕ و قەرەداغ خۆیان لە دەست (هۆلاکۆ) زەعیم صدیق ڕزگار بکەن. ئەو ڕووداوە بوو بە هۆی ئەوەی کە زۆربەی دانیشتوانی کوردستان عەبدوسەلام و کاربەدەستانی حکومەتی عێراق بەلەعنەت بکەن و بەهیچ بارێك نەیانەوێ جارێکی تر لەگەڵ حکومەتی (سلاما بژین. سەربازە دڕندەکانی زەعیم صدیق دەستیان دایە کاری بێ شەرمانە و دزی و تالاّن کردنی دانیشتوانی سلێمانی لەکاتی پشکنینی مالاّنا هەرچی بەکەڵك بهاتایە دەریان ئەهێنا و ئەیانبرد، ئەوەی کە ئەو سەربازە خوێنمژە پیسانە بەسەر سلێمانییان هێنا هەتا ئێستا لە مێژووی ئەم شارە شتێکی ئاوا بێ ڕەحمانەی بەسەر نەهاتووە، هەر گوللەی پێشمەرگە بەشەرەفەکان ئەتوانێ ئەو ڕووداوە وەرگێڕێتە سەربارێك کە مێژووی هونەرمەندی کورد بتوانێ بڵێ، تۆڵەی کردەوەی سلێمانیم کردۆتەوە. ناوی هەندێك لەو شەهیدانەش پێك هاتبوون لە:

(حاجی باقی، کەمالی حەمەی فەرەج ئەفەندی، مامۆستا اسماعیل برایم بەلوعەچی، مامۆستا یاسین صالح، مامۆستا حەمە بۆر، مامۆستا ئەنوەر سەعید دارتاش، عبدالمجید ڕەشید، کەمال علی پیروت، نامیق مستەفا بەگ و بابا علی شێخ معروف بەرزنجی)

هەروەکو لە سلێمانی ئەو ڕووداوە ڕووی دا، لە پاش ماوەیەکی تر لە کۆیەش هەمان کارەسات بەسەرپەرشتی (طە شکرچی) فەرماندەی هێزی سەربازی لە کۆیە ڕوویدا و، (١٨) لاوی تێکۆشەریان لە خەڵکی کۆیە لە پایەی چایخانەکان بەستن و ڕەمیان کردن.

لە دوای ڕێککەوتن و ئاشتبوونەوەی کورد و عەبدوسەلام، لە (زەعیم صدیق) یان پرسیبوو کە بۆچی ئەم کارەی کردووە؟ لە وەلاّمدا وتبووی کە ڕوحمێکی زۆری بە خەڵکی سلێمانی کردووە، حەق وایە خەڵکی سلێمانی سوپاسم بکەن، چونکە بروسکەی لەناوبردنی هەموو شاری سلێمانی بۆ هاتووە. ئەم کە بەم کوشتارە دەستپارێزی کردووە و، ئەو پەڕی بەزەیی و چاکەی لەگەڵ خەڵکی سلێمانی بەکارهێناوە، دەنا عەبدوسەلام دەسەلاّت و فەرمانی لەناودانی هەموو شاری سلێمانی پێ بەخشیوە. لە برانەوەی ئەو تەوژم و تینە و ئاشتبوونەوەی پێشمەرگە و سەرباز، خاوەن شەهیدەکان چاڵەکانیان هەڵئەکۆڵیەوە و، هەر کەسە شەهیدی خۆی بە نیشانەیەك: سەعات، قەڵەم، یان جلەکانی کە لەبەریاندا بوو ئەیانناسینەوە و، تەرمەکەیان دەرئەهێنایەوە و، لە گردی سەیوان ئەیانناشتن، لە شەهیدانی ئەو شەڕ و ڕووداوە گۆڕستانی شەهیدانیان لەو گردە دروستکرد.

لە شەوی ١٩٦٣/٦/١٩ دا لە ژێر فەرماندەی هاشم عقراوی و عەلی شەعبان وەکیلی مەلا مستەفا و مام طە لێپرسراوی حزبی ناوچەی بێتواتە و عەباسی مامەند ئاغا سەرۆك عەشیرەتی ئاکۆ و ئەنوەر بەگی سەرۆکی عەشیرەتی خۆشناو و حەقی ئاغای ناودەشتی و شێخ سمایلی سەید ئاوا، بەبێ تەقە پۆلیسخانەی ڕانیە گیرا. وەکیل قائمقام (محمود عبدالکریم مبارەك) و (واحد قادر ئاغا-مأمور مەرکەز) بەبێ هیچ بەرەنگاریەك لەگەڵ چل پۆلیسی چەکداردا تەسلیم بوون. دەستکەوتی پێشمەرگە لەم ڕووداوەدا بریتی بوو لە دوو سندوق فیشەك و (٢٠) تفەنگ و یەك دەستگای لاسلکی گەورە. لە ترسی بۆردومان هەر ئەو شەوە ئەوەی لە ڕانیە مابونەوە، بەتەواوی چۆڵیان کرد و، ڕانیە بە چۆڵی مایەوە. من لەگەڵ مأمورەکانی ڕانیە چووین بۆ قەلاّدزێ بۆ ئاگادارکردنی متصرفی سلێمانی بەهۆی (ئەنوەر عارف حیکمەت) ی قائمقامی قەلاّدزێ ووتی:-ئێوە ئەوە تەقریری چارەنوسی خۆتان وەرگرتووە، من بۆ ئێوە متصرف ئاگادار ئەکەم، بەلاّم ئەمشەو یان سبەی شەو ئێمەش ئەگیرێین، ئەوکات کێ بۆ ئێمە متصرف ئاگادار بکات. فعلا لە شەوی ١٩٦٣/٦/٢٢ دا قەلاّدزێش گیرا.

مأمور مەرکەزی قەلاّدزێ بە (٥٠) پۆلیسەوە تەسلیم بوو، ئەنوەر عارف حیکمەتیش هەتا نیهایەت بە حیجزکراوی هێڵرایەوە، مەحمود عەبدولکەریم قائیمقامی ڕانیە بە دیلی برایە ماوەت، چونکە

ویستبووی لەژێرەوە ئاگاداری زەعیم صدیق بکات و دڵسۆزیی میرزا ڕۆستمیەکانی سەنگەسەریان تێ بگەیەنن. لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٢١ دا لیوای پێنج گەیشتە کۆیە و هێزی پێشمەرگە کە لەژێر فەرماندەی عومەر دەبابەدا ئیشی دەکرد، ڕووی کردە چناروك و لەوێ ئیستحکاماتی دابەستن. لە ڕۆژی ٢٩ و٣٠ /١٩٦٣/٦ دا هێزی سەربازی لەگەڵ هێزێکی گەورەی جاش و حەرەس قەومی و فرسان (صلاح الدین) و فرسان (خالد) بەیارمەتی شەش فڕۆکەی جەنگی پەلاماری چناروکیان دا. لە پاش جەنگو بەرهەڵستیەکی زۆر مەردانە عومەر دەبابە ناوچەی چناروکی چۆڵکرد و گەڕایەوە بۆ شاخەکانی پشت ڕانیە. ئینکار ناکرێ ئەو هێزەی لەگەڵ عومەر دەبابەدا بوون، لە هەولێرەوە لەگەڵ ئەو هێزە گەورەیەدا هەتا شاخەکانی ناوچەی ڕانیە جەنگان. ئەوەی کە بوو بە هۆی کشانەوەی هێزی پێشمەرگەی ڕێگای کۆیە ئەو هۆیانەی خوارەوە بوون:

١-برسێتی و بێ تەنزیمی ڕێگای ژیانیان.

٢-بێ هێزی و بێ یارمەتی پێشمەرگەی ئیحتیات.

٣-بێ فیشەکی.

٤-ماندوبوونی نەفەرات و نەحەسانەوەیان.

هێزی پێشمەرگەی عومەر دەبابە لەم هەموو شەڕو پێك دادانەیاندا لە بەرامبەر ئەم هەموو هێزە گەورەیەی دوژمن لە شەست نەفەر پتر نەبوون, بەم هێزە کەمەوە توانیان دوانزە ڕۆژ بەرهەڵستی ئەو هێزە گەورە پڕچەك و خواردەمەنیە بکەن. هەرچەندە (عەباسی مامەند ئاغاو عەلی ئاغای مەنگوڕ) لە چناروك بە عومەر دەبابە ئەڵێن کە لەشکری عەشایەری بنێرن بۆ بەهێزکردنی هێزی پێشمەرگە، بەلأم عومەر دەبابە وەلأمی دابوونەوە کە: من هێزی عەشایری تێکەڵ بە هێزی پێشمەرگە ناکەم. عەشایرەکان عومەر دەبابە بەم قسەیە تاوانبار ئەکەن، گوایە ئەگەر عومەر دەبابە ڕێگای نەگرتبا لە بەشداری کردنی عەشایرەکان لەشەڕدا، چناروك نەئەکەوتە دەست حکومەت، کە شوێنێکی ئیستراتیجی زۆر بەکەڵك بوو بۆ پێشمەرگە.

لە شەڕی چناروکدا دوو پێشمەرگە شەهید ئەکرێن لەگەڵ دوو بریندار، بەلأم هێزی دوژمن کوشتار و برینداری زۆر بوو. لە ١٩٦٣/٧/٣ دا مەخزەنەکانی توتنی ئینحیصاری ڕانیە کە (٣٦) هەزار فەردە توتنی فحص کراوی حکومەتی تیابوو لەلایەن هەردوو پێشمەرگە مەغدید حەمیدی بەلوعە و غەریبی مام حسێن سوتێنرا. لە ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٣ دا لە معسکر (الرشید) لە بەغداد ئینقلابێکی گەورە لەلایەن شیوعیەکانەوە پێك هات. بەلأم حکومەت زۆر زوو ئەو ئینقیلابەی دامرکاندەوە. ئەو ئینقیلابە بوو بەهۆی ئەوەی کە زۆربەی شیوعیەکان موچە خۆر و ناموچەخۆر خۆیان بشارنەوە و بێنە ناو شۆڕشی کوردستانەوە.

لە ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٣ دا حکومەتی (مەنگۆلیا) قەزیەی کوردی گەیاندە ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بخرێتە ناو جەدوەلی کارەوە، ووتوێژی لەسەر بکرێ. بەلأم حکومەتی عێراق پەیوەندی لەگەڵ منغولیا پچڕاند و حکومەتەکانی عەرەبیش تەوصیەیان کردبوو ئەگەر مزەکەرەکە سەحب نەکات لە ڕیزی دۆستایەتی دەربێنن، لەسەر ئەوە (مەنگۆلیا) مزەکەرەکەی وەرگرتەوە، بەو بەڵگەیەی کە لە ئەنجومەندا یارمەتیدەری نابێ و قەزیەی کوردی پێ فەشەل ئەبێ.

ڕۆژی ١٩٦٣/٧/٥ هێزی زەعیم صدیق هاتە ڕانیە، بەو هیوایەی کە بچێ بۆ پشدەر، بەلأم لەبەرئەوەی کە ئیستحکاماتێکی زۆر قورس لەسەر ڕێگای پشدەر کرابوو، ڕێگای دەربەندیان تێکدابوو، بە کوشتارێکی زۆر نەبوایە نەیئەتوانی بچێتە پشدەر، بۆیە بە ناچاری وازی لە چوونە پشدەر هێنا. ئەمجا لەگەڵ ئاغاکانی ڕانیە و پشدەر کەوتە وتووێژ بۆ ڕێکەوتن. (شێخ جەنەتی شێخ ڕەزا سعید ئاوا و مەلا عثمان پڵنگان و مراد ئاغای مامەند ئاغا) بوون بەوەفدی مزاکەرەی نێوان میراودەلی و ئاغایانی ناوچەی ڕانیە. لە هەموولایەکەوە کەوتە بەڵێندان و سوێندی شەرەف و پارە بلأوکردنەوە، بەلأم هەتا دوائاکام نەیتوانی بگاتە ئاقارێکی باوەڕپێکراو. مەبەستی زەعیم صدیق ئەوەبوو کە عەشائیرەکان لە شۆڕش دوور بخاتەوە و پارێزگاری قەزای ڕانیە و پشدەریان پێ بکات بەرامبەر پارە. بەلأم عەشایرەکان غیرەتیان قبوڵی ئەو ئیشە سوکەی نەئەکرد. بەتایبەتی شێخ حسین بۆسکێن و عەباس ئاغا کە زۆر بە ئاسانی ئەیانتوانی بەم ناوەوە مەرکەزی حکومەتی لەگەڵ پارە و دەسەلأتێکی زۆر وەربگرن. بەلأم عیزەتی نەفسیان قبوڵی ئەم بیروباوەڕە تەسکەی نەکرد. هەتا کۆتایی زەعیم صدیق نەیتوانی هیچ سودێك لەم پیلانە وەربگرێ، بەلأم عەشایەرەکان توانیان وەفدە دیلکراوەکەی زەمانی (١٩٦٣/٣/٣٠) کە بەسەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی چووبوون بۆ بەغدا، لە زیندانی عەبدولسلام عارف دەربێنن بە ناوی ئەوەی کە بەهۆی ئەو دیلانەوە ئەتوانن ئیعتمادی میراودەلیەکان تەواو وەربگرن. فعلا ئەم دیلانە بەو هۆیەوە لە زیندانی عێراق ڕزگارکران، کە بریتی بوون لە (ساڵح یوسفی، شێخ حسین احمدی خانەقا، شاخەوان و کاك مسعود).

ئەمجا لە هەموولایەکەوە، لە زاخۆوە تا خانەقین لە نێوان پێشمەرگەو جاش و پۆلیس و سەربازی حکومەتی بوو بەشەڕ. دەوڵەتی خوێنمژ بە تەیارە و تۆپ و دەبابە و چەکی وڵات کاولکەری بێ ڕوحمانە، بەبێ پشودان بە شەو و ڕۆژ پەلاماری هێزی پێشمەرگەی قارەمانی ئەدا. پێشمەرگەی نەبەزیش لەهەموو ناوچەی کوردستاندا وەکو یەك بەرگری دوژمنی ئەکرد و، لەسەر ڕێگای دەبابە ڕائەوەستا. بەبێ موچە و خواردن بەرهەڵستی هێزی دوژمنی ئەکرد و چەکەکانی لێ وەرئەگرت و ئەیکردە شانی خۆی. بە نانی هەمبانە و ساچمەزەن بەرامبەر بە حکومەتێك ڕاوەستابوون کە میزانیەکەی بریتی بوو لە (٧٠٠) ملیۆن دینار لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموولایەکدا، چۆکی بە دوژمن دادابوو.

قاتوقڕی ڕووی کردبوە کوردستان، کیلۆی شەکر گەیشتبووە (٥٠٠) فلس و تەنەکەی نەوت بووبوو بە دینار ونیوێك کیلۆی ڕۆنی هۆڵندە بووبوو بە (٥٠٠) فلس، حکومەتی عێراق لەهەموو لایەکەوە حصاری ئابووری لەسەر میللەتی کورد دانابوو. مانگی جارێك قافڵە لە بەغداوە ئەهات بۆ سلێمانی. هەتا ئەگەیشتە شوێنی مەبەست پێشمەرگە لە پەنجا جێگاوە ڕێگای بە قافڵە ئەگرت و لەگەڵیا ئەکەوتە شەڕ، بەم گیانی پڕ هەڵمەت و ئازایەتیە تەنگیان بەهێزی دەوڵەتی هەڵچنی، دوژمنیان لەهەموو لیوای سلێمانی و شوێنەکانی تر پاك کردەوە. ئەمجا حکومەتی عێراق هیچ چارەیەکی نەما لەگەڵ حوکمەتی بەعسی سوریا یەکی گرت، لیوایەك سەربازی سوریەی بە هەموو کەرەسەیەکی جەنگی هێنایە کوردستان و بەگژ کوردەکانیدا کردن. بەڵام پێشمەرگە قارەمانەکانی کورد لە قوڵی زاخۆ، ئاکرێ و ئامێدی پەلاماریان دان وەکو کەو خستیاننە ناو تەڵە دەستیان کرد بە کوشتار و گرتنیان.

حکومەتی عبدالسلام سەری لێ شێوا، ئەم بێ هێزی و تەکانەی خۆی بەهی حکومەتی بەعس ئەزانی، لە نێوانی علی سالح سەعدی وەزیری ناوخۆ و جێگری سەرۆك وەزیران و ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆك وەزیران و طاهیر یحیی سەرۆکی ئەرکانی سوپا لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو بەقرە. میشێل ئەفلەقیان بۆ چارەسەری ئەو ناخۆشیە لەسوریەوە هێنایە عێراق (منذر وەنداوی) فەرماندەی هێزی حەرەسی قەومی ڕۆژی ١٩٦٣/١١/١٣ بەتەیارە چەند جێگایەکی عەسکەری بۆردومان کرد و، هەرایەکی گەورە لە عێراقدا ڕوویدا، عەبدوسەلام عارف لە ڕۆژی ١٩٦٣/١١/١٨ دا هێزی عەسکەری لە دژی بەعسیەکان بەکارهێنا و بەکوشتارێکی زۆر گەورە بەعسیەکانی چەك کردو کۆتایی بەم جموجوڵە هێنا، ئەمجا عەبدوسەلام یەك کەرەت ناوی لە خۆی نا (مشیر الرکن) و فەرماندەی هێزی چەکداری و سەرۆکی کۆماری عێراق. دەسەڵاتی (مەلا یسال)ی دا بەخۆی و معاشەکی خۆی گەیاندە (٨٠٠) دینار و، باسی یەکیەتی لەگەڵ میسر کردەوە.

لە ١٥/کانونی یەکەمی/١٩٦٣ دا کۆنگرەی قیمەی عەرەبی لە میسر بەسترا و لەم کۆنگرەیەدا بەسەرهاتی کورد خرایە بەرچاو. ئەمجا شێخ ئەحمەدی بارزان و عبدالسلام کەوتنە مزەکەرەی نهێنی، چونکە لەوکاتەدا شێخ ئەحمەد خۆی تەسلیم بە حکومەت کرد و، لەسەر ئیزگەی عێراق بەیانی شێخ ئەحمەد خوێنرایەوە، بەم عیبارەتەی کە واز لە (ئاڵۆزی و بلۆزی) بێنن و بگەڕێنەوە بۆ لای حکومەت. جا بەهۆی شێخ احمەدەوە دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ مەلا مستەفادا کرایەوە، لە ڕۆژانی ٣٠ و ١٩٦٤/١/٣١ متەصریفی سلێمانی زەعیم عبدالرزاق مەحمود لەسەر ڕاسپاردەی عەبدوسەلام عارف لە ڕانیە لەگەڵ مەلا مستەفا کەوتە مفاوەزە.

لە ڕۆژی ١٩٦٤/٢/١٤ دا لە نێوانی حکومەت و مەلا مستەفا ڕێکەوتن پەیدابوو، بڕیاری ڕاگرتنی شەڕ بڵاوکرایەوە، کە لەدوایدا ناویان لەو ڕێکەوتنە نابوو ڕێکەوتنی (سێو و پرتەقاڵ و مۆز) مەلا مستەفا بەیانێکی بەهۆی ڕادیۆی عێراقەوە بڵاوکردەوە، کە تێیدا هاتبوو بۆ هەموو برا پێشمەرگەیەکی کە تاوی داوەتە چەك بۆ وەرگرتنی ماف لە حکومەتی عێراق، لە ئێستاوە شەڕ ڕاوەستاوە، بچن بۆ سەر ئیش و کاری خۆتان، ڕێگاکان بەرەڵا بکەن، چونکە لەگەڵ حکومەتا پێك هاتووین. مشیرالرکن عبدالسلام عارفیش ئەم بەیانەی خوارەوەی بڵاوکردەوە، کە لەبەر سودی گشتی لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی، لەسەر ئەو مادانەی خوارەوە ئیتیفاق پێکهاتووە:

١-دان نان بە مافی برا کوردەکان لەوەحدەیەکی نیشتمانیدا و جێگیرکردنی مافیان لە دەستوری موەقەتا.

٢-بەردانی دەستبەسەر و حکومدراو بەهۆی ڕووداوەکانی کوردستان و داهێنانی بەخشینی گشتی و هەڵگرتنی حجز لەسەر ئەو ماڵانەی کە بەهۆی کارەساتی شمال تووشی حجز هاتوون.

٣-گەڕانەوەی ئیدارەی حکومەتی بۆ ناوچەکانی (شمال).

٤-گەڕانەوەی موچە خۆرە دەرکراوەکان بۆ سەر کارەکانیان.

٥-هەڵگرتنی حصاری ئابووری.

٦-دەستکردن بە چاککردن و ڕێکخستنی (شمال) لەگەڵ دانی تەعویز.

٧-تەعویزدان بەو خاوەن زەویانەی کە زەویەکانیان ژێر ئاو کەوتووە.

٨-گەڕانەوەی خۆشی و ژیانی سەربەستانە بۆ ناوچەی (شمال).

٩-پێویستە وەزیرەکان پەلە بکەن بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو خاڵانەی سەرەوە.

لە هەموو لایەکەوە خۆشی و شادمانی کەوتە ناو پێشمەرگە و لە وەزیفە دەرکراوەکان، ژن و منداڵی ئەو دوورخراو و زیندانکراوانە ڕۆژێکی خۆشیان بەسەر هات. لەناو کورد و عەرەبا و بەتایبەتی سەربازە تەسریح نەکراوەکان، ئەو ڕۆژ و ڕووداوەیان زۆر پێ خۆشبوو، چونکە مەودایەکی زۆر بوو تەسریحی سەربازی ڕاگیرابوو. نزیکەی هەزار ئەفسەر و مفەوەز و پۆلیس و سەرباز کە لەلایەن پێشمەرگەوە دیل کرابوون، بەرەڵا کران تەنیا ئەو کەسانە لە زیندانی حکومەتدا مانەوە کە لەسەر شیوعی گیرابوون. حکومەت دەستی کرد بە ناردنی خواردەمەنی و زەخیرە بۆ هێزی پێشمەرگە و مەلا مستەفا چەند دەستەیەك سەربازی خستە ژێر فەرمانی مەلا مستەفا و چەند سەربازێکی تریشی بۆ ئیش و کاری مەلا مستەفا ناردە سەنگەسەر، بەم شێوەیە لە هەموو لایەکەوە لە نێوانی مەلا مستەفا و حکومەتدا ڕێکەوتن پێکهات.

سەرچاوە: بەسەرهاتی سیاسیی کورد لە ١٩٥٨/٧/١٤ تا ١٩٨٥
میرزا ئەمین مەنگوڕی، چاپی یەکەم: ١٩٩٨، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕوناکبیریی گەلاوێژ.

# هەیئەتی ئارامیی لە شیمالی عێراقداو مەتالیبی کوردەکانو هەندێ شتی تر

میرزا مەنگوری

لە ڕۆژی (١٩٣٠/٨/٨) دا وەکیلی مەندوبی سامی و وەکیلی ڕەئیس وزەرای عێراق گەیشتنە کەرکوك، عمومی ئەشرافی کەرکوك و سەرۆك عەشایەرەکان لە (قشڵە) کۆکرانەوە. ڕەئیس وزەرا (جەعفەر پاشا ) هەڵسا ئەو بەیاناتەی خوێندەوە کە لە عوسبەت ئومەمەوەو بۆ کوردەکان مقرەر کراوە، عێراقیش حازرە ئەو شروتانە هەموی تەتبیق بکات. ئەمجا مەندوبی سامی هەستا ئەویش نەتقێکی خوێندەوە تەئیدی ڕەئیس وزەرای عێراقی کردەوە و گوتی: ئێمەش حازرین کە یارمەتیتان بدەین بۆ تەتبیقی ئەو قەراردادەیە. بەشەرتێ یارمەتی وەحدەتێکی عێراقی بدەن و داوای جیابونەوە نەکەن.

عەبدوڵا سافی یەعقوبی گوتی: لەم بەیاناتەتان زۆر متشکرین زاتەن ئەم لیوایە عیبارەتە لە تورك و عەرەب، نفوسی ئەو لیوایە کە (١٥٠) هەزار کەسە عیبارەتن لە دوو عونسرە. ئەسلا ئێمە عێراقین نامانەوێ لە عێراق جیاببینەوە.

مستەفا یەعقوبی – ئەویش هەڵسا تەئیدی کاکی (واتە عەبدوڵا سافی یەعقوبی) کرد.

(فارس ئاغای بەیاتیش) بۆ ئیستیقلالی عەرەب ئەپاڕایەوە. (شێخ حەبیب تاڵەبانیش) بەحەسەب قازیەتی و مەئمورایەتیەکەی تەئیدی(عەبدوڵا سافی) کردەوە، لەو چوار کەسە زیاتر لە کەرکوك هیچ کەس لە بیرو داوای جیابونەوەی کورد جیانەبونەوە.

(محەمەد بەگی جاف) مەندوبی کەرکوك، وەکو شێر هەڵسایە پێو گووتی: لیوای کەرکوك بە ئەکسەریەت کوردن و، ئەوەی تری ئەمجا عەرەب و تورکە، (زەنگەنە، جاف، شوان، جەباری) هەموو عەشائیری لیوای کەرکوك منیان تەوکیل کردوە، بەو ناوەوە داوای جیابونەوەی کورد ئەکەین لە عێراق. داوای ئیستیقلالی زاتی و تەتبیقی موقەرەراتی عوسبەت ئومەم ئەکەین، ئەمانەوێ بە کوردی بژین و بە کوردی بمرین، ئەوە حەقی خۆمانەو ئەمانەوێ هەتا دوا هەناسەمان.

(عەبدوڵا سافی یەعقوبی) خیلافی ئادابی موجتەمیع بەتەهەورەوە هەڵسایە سەر پێو گووتی: ئەم زاتە بەناوی کێوە قسە ئەکات، جاف عائیدی سلێمانیە، شتێکی کەمی عائیدی کەرکوکە، حەق وایە بچێتە سلێمانی لەوێ داوای حەقی جاف بکات.

(محەمەد بەگی جاف): من بەناوی (١٥٠) هەزار جافەوە قسە ئەکەم، تیکراری ئەکەمەوە کوردم، بە کوردی بووم، بە کوردی ئەژیم، بە کوردی ئەمرم، ئێرەش کوردە، هەموو کوردێك داوای حەقی خۆی ئەکا.

(جەعفەر پاشا) هەڵساو ڕووی کردە (محەمەد بەگی جاف) گووتی: بە شەرەفی حکومەت و خۆم تەئمینت ئەکەم، کە بەتەواوی موقەرەراتی عوسبەت ئومەم-تان بۆ تەتبیق ئەکەین، ئەم لیوایەش ئیستیفادەی لێ ئەکا.

(محەمەد بەگیش) گووتی: پاشا تەشەکورتان ئەکەم.

(سەید ئەحمەدی خانەقا) هەستایە پێ گووتی: بە هەموو مەعنایەکەوە تەئیدی محەمەد بەگ-ئەکەم و تەئیدی ئەوانەش ئەکەم کە داوای حقوقی کوردیان کردووە.

(سەید محەمەد جەباری): تەئیدی محەمەد بەگ ئەکەم و داوای جیابوونەوەی کورد ئەکەم لە عێراق. لەگەڵ ئەوانەم کە نایانەوێ لەگەڵ عێراقدا بژین.

ڕۆژی شەمبەی (١٩٣٠/٨/٩) ئەو هەیئەتە چوون بۆ هەولێر و لە سەعات (١٠)ی ئینگلیزی لەسەرا لەمەقامی موتەسەریفدا، ئەشراف و ڕوئەسای عەشائیرەکانەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا، (جەعفەر پاشا) ڕەئیس وزەرا بەیاناتەکەی کەرکوکی خوێندەوە. مەندوبی سامیش بەعەینی ڕاوێژو عیبارەت تەئیدی بەیاناتی جەعفەر پاشای کردەوە. (ئەحمەد ئەفەندی)ی ئەعیان وەکو شێر هەستایە پێو گووتی: قسە بکەن، چونکە هەموویان مەزبەتەیان داوە، مەندوبی سامی گووتی: باشە.

ئەمجا عەشایرەکان گووتیان: ئێمە بە عمومی (خدری ئەحمەد پاشامان) کردووە بەوەکیلی خۆمان، هەرچییەك ئەو بیڵێ قسەی ئێمەیە.

(خدری ئەحمەد پاشا): لیوای هەولێر بەتەواوی لەگەڵ سلێمانی دایە، خواهش (تکا) ئەکەین، کە هەولێرو کەرکوك‌و دهۆك و سلێمانی لەیەکتر جیامەکەنەوە. هەرچییەك ئەدرێ بە سلێمانی ئێمەیشی لێ بێ بەش مەکەن.

(ئەحمەد بەگ ئەعیان): ئێمە کوردین، حقوقی خۆمان ئەوێ چەند ساڵە لە خزمەتی حکومەتام و، تێگەیشتوم کە کورد بەعمومی لەسەر حقوقی خۆی ئیسرار ئەکات و، ئەو حەقە بە قەراری عوسبەت ئومەم دامەزراوە، پێویستە بماندرێتێ.

ئەمجا (جەعفەر پاشا) تەئسیری کردە سەر قسەکانی (ئەحمەد ئەفەندی) و ئەویش بەزمانێکی سەریح بە (جەعفەر پاشای) گووت: تۆ بۆ عەرەبەکان (دوو پەنجەت) دانا، ئێمەش حەقمانە بۆ قەومی کورد گیانی خۆمان فیدا بکەین، کەس حەقی عیتابی نیە. (ئیسماعیل بەگی ڕواندزی): فەخامەتی جەعفەر پاشا، ئێمە چیکە بەو قسە پڕو پوچانە فریو ناخۆین. لەسەر قەراری عوسبەت ئومەم حەقی خۆمان ئەوێ و ئەبێ بە فەوری لیوای دهۆکمان بۆ تەشکیل بکەن. ئیمتیازی سەربەخۆییمان بۆ دیارو جیا بکەنەوە.

(مەعروف جیاووك) هەڵساو گووتی: وا ئەزانم جەنابی فەخامەت وەکیلی موعتەمیدی سامی، موساعەدە ئەفەرموویت کە چەند قسەیەك بکەم. ئەو بەیانەی کە (جەعفەر پاشا) خوێندیەوە دوو شتی تێگەیشتم: یەکەم تەڵەبی وەحدەتی عراقی کورد و عەرەب. دووەم عەدەم ئیمکناتی تەئیدی حقوقی کوردان بە ماددەیەکی خاص لە موعاهەدە. لە پێش جەوابدا مەندوبی سامی گووتی: هەندێ جێگا وازەن ئەکەن، کە ئێمە تەشویقی هەندێ کەس ئەکەین. ئەگەر کەسێکی وا ببێ و بێتە دار ئیعتیمادو لە خۆیەوە قسەیەکی وای کردبێ، ڕەدێ ئەکەینەوە کە ئێمە لەگەڵ حکومەتی عێراقدا یەکین.

ئەمجا (مەعروف جیاووگ) گووتی: ئەبێ فەخامەتی بەناو جەعفەر پاشا باش بزانن، کە من کوردم و، هەموو کوردێکیش وەکو من تابعی هیچ تەئسیرێ نییە، میللەتی کورد بەسائقی و وجدانی قسەو ئیدعای حقوقی خۆی ئەکات. بەڵێ زۆر دەفعە بەعزێ کەس کەلەوەزیفەی گەورەدان و، شەرم ئەکەم ناویان بێنم، بەمنیان ئەگووت: ئێوە بەپەنجەی بێگانە ئەو تەڵەبە ئەکەن.

(مەندوبی سامی) گووتی: ئەجنەبی کێیە؟ بێگانە یەعنی ئینگلیس، دەلیلم ئەوەیە کەپار ساڵ ئەم (جەمال بابان)ەی کەحاڵی حازر دانیشتوەو، وەزیرە، بەمەزبەتە داوای حەقی کوردی کردبو،



ئەویشیان هەر بەو تەرحە ئیتهام ئەکرد کە پەنجەی ئەجنەبی ئەو نیشە ئەکات.

بابێینەوە سەر حقوقمان، جەنابی فەخامەت مەئاب وەکیلی مەندوبی سامی، باش ئەیزانی کە حکومەتی بەریتانیا بەشەرەفی خۆی تەعەهودی کردووە، کە موقەرەراتی عوسبەت ئومەم تەتبیق ئەکات, جا بەو موناسەبەتەوە هەموو کوردێك چاوەڕوانی ئەوەیە کە حکومەتی بەریتانیا بڕیارەکەی خۆی بەرێتە سەر. زۆر ئارەزوو ئەکرا جەعفەر پاشا لە جیاتی ئەو کاغەزەی کەلەجانتاکەی دەری ئەهێنیٚ، موقەرەراتی عوسبەت ئومەمی دەربهانیایەو بە ئاشکرا بیخوێندایەوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك لە موقەرەراتەکانی عوسبەت ئومەم ئاگادار ببوایە. هەرچەندە کە من بە چاوێکی حقوقی خوێندومەتەوە جەمال بابان و جەعفەر پاشاش ئەزانن کە من حقوقیم.

لەسەر ئەوە جەعفەر پاشا، مەندوبی سامی و موفەتیشی ئیداری دەستیان کرد بە سرکە سرکە و موفەتیشی ئیداری چووە دەرەوەو، قەراری عوسبەت ئومەمی هێناو تەسلیمی مەندوبی سامی کرد. کە مادەیەکی ئەوە بوو کەمەئمورەکانی کوردستان لە عونسری کوردی بیٚ، زمانی کوردی ڕەسمی بیٚ.

ئەمجا جەعفەر پاشا گوتی: نالیٚ مەئمورەکان کوردو لەعونسری کورد بن، ئەلیٚ هەر کوردی بزانن. مەندوبی سامیش قەرارەکەی خوێندەوەو، تەرجەمە کرا، قسەی مارف جیاووك دەرچوو. ئەمجا ئەحمەد ئەفەندی هەڵساو گوتی: ئەو مادەیە سەریحەو تەفسیرو تەئویل قبولٚ ناکا. مارف جیاووکیش گووتی: فەقەرەی ئەخیری قەرارادەکە ئەلیٚ: هەرکاتیٚ تەبدیلێك لە حکومەتی عێراقدا بوو، ئەبیٚ حوکمێکی زاتی لەسەر ڕەغبەتی کوردەکان بە کوردەکان بدریٚ.

مەندوبی سامی گوتی: ئەو لائیحەیە قەراری عوسبەت ئومەم نییە، هەتا لەکەرکوکیش لەوێنەی قسەکەی تۆ شتێکم بیست.

مارف جیاووك گوتی: بەلیٚ ئەو لائیحەیە لەلایەن عوسبەت ئومەمەوە تەسدیق کراوەو، بلاٚوکراوەتەوەو شکلی قەراری وەرگرتووە.

لەدوای ئەو ڕەدیاتە جیاووك هاتەوە سەر مەوزوع و گوتی: وەکو عەرزم کردن بەیاناتەکەی جەعفەر پاشا دوو شتی تیایە:

١-ئیتحادی کوردوعەرەب، جەعفەر پاشا باشی ئەزانیٚ کە ئێمە لەگەلٚ عەرەبا بە صورەتی تەوحید ناژین، بەلاٚم مومکینە وەکو (مەجەرستان) ئیدارە بکەین، هەموو کەس چاوی کراوەتەوە قبولٚی ئەسارەت ناکا، جەریدەکانی بەغدا هاوار ئەکەن ئەلێن ئێمە عەرەبین حکومەتەکەمان عەرەبە. ئەبیٚ کوردەکان وەکو ئەرمەنییەکانیان لێبکریٚ. جا مومکین نییە بەصورەتی قەتعی بەیەکەوە بژین.

جەعفەر پاشا بە تەهەورەوە گوتی: من قسەت نادەمیٚ، حەقت نییە ناوی عەرەب بێنی.

مەعروف جیاووگ گوتی: پاشا من قسەم لە مەندوبی سامی سەندوە. منیش بەقەدەر تۆ عەرەبەکان تەقدیس ئەکەم، بەلاٚم کوردم و کوردم ئەویٚ.

٢-تەناقزێك بە زاهیری لە قسەی جەعفەر پاشادا هەیە، لەلایەکەوە ئەفەرمویٚ حکومەت مەشغولٚی قانونێکە بۆ حقوقی کوردان، لە جیهەتێکی تریشەوە ئەلیٚ ئەو حقوقە موغایری ئسولٚە کە مادەیەك داخلٚی موعاهەدەکە بکریٚ.

بەندە بە نەزەرێکی حقوقی ئەلێم مومکینە مادەیەك داخلی موعاهەدەکە بکریٚ، کە ئەو مادەیە بەتەواوی حقوقی کوردەکان تەئمین بکات لەمەدا ئەبیٚ مانع چی بیٚ؟ خولاٚسە هەموو کوردێك داوای حقوقی خۆی ئەکات.

### هەینەت لە سلێمانیدا

هەینەت ڕۆژی (١٩٣٠/٨/١٠) بۆ سلێمانی کەوتە حەرەکەت لەسەعات (٣) ی کوردی کە میعادی هاتنیان بوو، هەموو ڕوئەسای دەوائیرو مەئمورین و ئەشراف و عولەماو ڕوئەسای عەشائیر کە لەسلێمانی حازر کرابوون چوون بەپیر هەینەتەکەوە.

لەسەر جادەی (دەباخ خانە) کە ئێستا خانوی موتەسەریف و حەدیقەی بەلەدیەیە، بەلەدیە ڕەشمالٚی بۆ دانیشتن هەلٚ دابوو. غەیری ئەمانەش دەستەیەك سەربازی حکومەتی لای ئەهالیەکە وەستابون. کەشافەی مەکتەب و قوتابی مەکتەبەکان بە ڕیز ڕاوەستابوون، دوکان و بازاڕ داخرابوو، ژن و پیاو هەموی جمیابو بۆ ئەو ناوچەیە. شار خرۆشابو، پۆلی ژنان لەسەر تەرزێکی جوان تیپ تیپ ڕیز بوبون.

لە چەمچەمالٚیش بەعەینی تەرتیبات عەشائیری هەمەوەند و خەلٚکی چەمچەمالٚ ڕێگا بەو هەینەتە ئەگرن، لە سەعات (١٠)ی عەرەبی ئەو هەینەتە بەرەنگاری ئەو حەشاماتە ئەبن. لە چەمچەمالٚ ئەوانیش بە هاوارو چەپلە ڕێزان داوای حقوقی کوردیان لیٚ ئەکەن. لەسەعات (٤،٣٠) کوردیدا ئەو هەینەتە واردی بەر حەدیقەی بەلەدیەی ئێستا بون. لەلایەن عەسکەرەکانەوە سەلامیان بۆ ئەکریٚ. ئەمجا هەینەت لە ناو حەشاماتی بیٚ پایان دائەبەزن و لە هەمو لایەکەوە بە چەپلە ڕێزان و، هەربژی کوردو کوردستان دەنگ بەرز کرایەوە، کە بەقەتعی عەرەبمان ناویٚ و تەشکیلاتی حکومەتی کوردمان ئەویٚ.

قوتابیەکی مەکتەب بەجلی کەشافەوە، هاتە بەر دەمیان خیتاب بە فەخامەتی مەندوبی سامی نەتقێکی بە ئینگلیزی خوێندەوە، هەر بژی کورد و کوردستان حکومەتی بەریتانیاو فەخامەتی مەندوبی سامی و فەخامەتی ڕەئیس وزەرا دەست پێکرا، لەدوای ئەمە بە ئۆتۆمبیل هاتنە ناو شار دەستەی ژنان لە هەمو کۆلاٚن و سەربانێك هاواریان لیٚ هەلٚسا بۆ تەشکیلاتی کوردی و سەربەخۆیی.

مەندوب سامی چوو بۆ ماڵی موفەتیشی ئیداری کاپتان گاون. ڕەئیس وزەراو وەزیری داخلیە چونە ماڵی موتەسەریف و، جەمال بابان چو بۆ ماڵی عەزمی بەگ.

ئەو ئیزدیحامە لە ناو شارو بەردەرگای سەرای سلێمانی هەتا ڕۆژی (١٩٣٠/٨/١١) دەوامی کرد.

بەیانی سەعات (٢) هەموو لایەك لەسەرای حکومەتی کۆبونەوە، دوکان و بازاڕ داخران. تەلەبەی مەکتەب و هەموو ئەهالی بە ئینتیزامەوە ڕاوەستان. کە هەیئەتەکە هات بۆ سەرا، لەبەردەمی خڕبوونەوە، بەجارێك خەڵکەکە چونە بەردەمی ئوتومبیلەکەی مەندوبی سامی بە هەزاران دەستە گوڵیان خستە ناو ئوتومبیلەکەو دەوروپشتی و، بەیەك دەنگ هاواریان ئەکرد، حقوقی میلەتمان داوا ئەکەین و، ئەبێ حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا بماندانتێ. بەو تەرزە هەیئەت چونە مەقامی موتەسەرفیەت و، ڕەئیس وزەرا بەیاناتەکەی دەرحەق بە ئیتحادی کوردو عەرەب و، وەحدەتی عێراق و تەتبیقی قەراردادەی عوسبەت ئومەمی خوێندەوە. مەندوبی سامیش هەروەکو لە هەولێرو کەرکوك تەئیدی جەعفەر پاشای کردەوە.

(حەمە ئاغای عبدالرحمان ئاغا) گوتی: جەماعەتی حازرە تەمسیلی هەموو سادات و عولەماو ئەشراف و عەشایری لیوای سلێمانی ئەکات، لەگەڵ قسمێکی لیوای کەرکوك. هەموویان (ڕەمزی ئەفەندی) یان تەوکیل کردووە کە جوابی فەخامەتی مەندوب سامی بداتەوەو، داوای حقوقی کوردیمان بۆ بکات.

(ڕەمزی ئەفەندی) هەڵسایە سەرپێ و گوتی: بەناوی هەموو سادات و عولەماو ئەشراف و عەشایری کورد عەرزی بەخێرهاتنیان ئەکەم. میللەتی کورد بۆ حورییەت و ئیستیقلالی خۆی تەشریف هێنانتان بە خاڵێکی خێر دادەنێ. بەڵام بەیاناتی فەخامەتی ڕەئیس وزەراو مەندوب سامی کولیەن موخالیفی قەراردادەی عوسبەت ئومەمە، لەپێش هەموو شتێکدا ئەبێ ئیستیقلالی کورد ببێ بە سەبەبی ئیتحادی کوردو عەرەب.

کوردەکانی کوردستانی جنوبی لە ئەوەڵی حەربی عمومیەوە هەتا ئێستا بۆ وەرگرتنی ئیستیقلالی خۆیان تەقسیرییان نەکردووە، کەچی هەتا ئێستا هیچ مەتاڵیبێکمان لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە بۆ پێك نەهاتووە لە ڕەغمی ئەوەی کە عوسبەت ئومەم بە سەراحەت باسی ئازادبونی ئێمەی کردووە.

موعاهەدەی بەینی حکومەتی عێراق و ئینگلیس بە تەئریخی (١٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢) کە تەسدیق کراوە، لەپاش(٧٤) ڕۆژ لە تەئریخی (٢٤واتە لە کانونی یەکەمی ١٩٢٢) بۆ تەشکیلی حکومەتێکی کوردی لە بەینی حکومەتی بەریتانیاو عێراق ئەم بەیانە بەتەواوی بڵاو کرابۆوە. مادام عوسبەت ئومەم ئینتیدابی عێراقی داوە بە ئینگلیس، حەق وابوو ئینگلیس حکومەتێك بۆ کوردەکان دروست بکات. لەپێش تەنزیمی موعاهەدەی ئینگلیس و عێراق بەسەراحەت تەشکیلاتی کوردیش بخرایەتە ناو ئەو موعاهەدەیەوە، ئینگلیس بە تۆپ و تەیارە وڵاتی کوردی ئیستیلا نەکردووە، کورد بە ڕەغبەتی خۆی تابیعی نفوسی ئینگلیس و عەرەب بووە. حەق وابو لەگەڵ تەشکیلاتی عەرەبدا ئینگلیس تەشکیلاتێکیش بۆ کورد دروست بکات.

مەندوبی سامی هەڵساو ئەم بەیاناتەی دا: لەخوتبەی ڕەمزی ئەفەندی دوو نوقتەی موهم هەیە یەکەم بەیانی ١٩٢٢ و دووەم موقەرەراتی عوسبەت ئومەم.

بەیانی ١٩٢٢ لەوەختی خۆیدا لەتەرەف حکومەتی بەریتانیاوە جواب دراوەتەوە، جا لەبەر ئەوە حەز ناکەم لەسەر ئەو مەوزوعە بڕۆم.

موقەرەراتی عوسبەت ئومەمیش بەلای منەوە حەرفییەن ئەو تەوسیاتە بەئەنجام گەیشتوەو، من موتەئەسیفم ئەگەر ئەو وەعدانە شکێنرا بن، بەڵام تەقدیرو تەنفیزو عەدەم تەنفیزی ئەو موقەرەراتە بەدەست عوسبەت ئومەمە. حکومەتی بەریتانیاو عێراق هەردوو لایان سەعی ئەکەن بۆ تەنفیزی موقەرەراتی عوسبەت ئومەم.

عوسبەت ئومەمیش ئەگەر بزانێ موقەرەراتەکەی تەنفیز نەکراوە موداخەلە ئەکات. وەکو حاڵی بووم هێندێ کەس موراجەعەتیان بە عوسبەت ئومەم کردووەو، وەڵامیشیان وەرگرتۆتەوە، کە ئەبێ بەهۆی حکومەتی مونتەدیبەوە موراجەعەت بکرێ. ئێستا عەینی موراجەعەت بە من کراوە، من لەو خسوسەوە لەگەڵ حکومەتی عێراق موزاکەرە ئەکەم. لەو بەیاناتەما کەس وا حاڵی نەبێ کە من مەقسەدم مومانەعەت و مشکیلات نیشان دانە. هەموو کەسێك سەربەستە لە موراجەعەت کردن. بەڵام لازمە مەتاڵیب سەریح و بەتەفسیل بەیان بکرێ، تەشکیلی حکومەتێك لێرەدا موشکیلەیە. نازانم ئایا قابیلە کوردستان بتوانێ ئەو حکومەتە ڕابگرێت یا نا. ناشزانم ئاخۆ (ڕەمزی ئەفەندی) تەمسیلی هەموو کوردستان ئەکا یان هەر سلێمانی.

(ڕەمزی ئەفەندی) گوتی: خوتبەی هەولێر مەعلومی ئەکات، من لە هەولێر بە خۆتیان وتووە کە مەتالیبمان لەسەر سلێمانی و بەشێکی عەشایری کەرکوك لەو مەجلیسەدا حازر بوون. خوتبەی عمومی عەشایری کەرکوکیش تەقدیم ئەکەم و مومەسیلی هەولێریش دیسان لێرە مەوجودە.

(مەندوبی سامی) گوتی: چوینە هەولێرو کەرکوك لەوێش مومەسیلی کوردان کۆبونەوە. بەڵام کەسیان داوای جیابونەوەیان نەکرد، تەنها سلێمانی داوای فیراق ئەکات.

(ڕەمزی ئەفەندی) گوتی: ئەم دوو لیوایە لە ژێر تەئسیرو تەزیقاتەوە کتوپڕ هاتونەتە حزوری ئەو هەیئەتە نەوێراون لەبەر سوئی عاقیبەت، بە سەراحەت مەتالیب بەیان بکەن. نمایندەکانیان جەلبی سلێمانی بکەن عەینی داوای ئێمە تەئید ئەکەنەوە.

(مەندوب سامی) گوتی: کەوابو هەموو لایەك مەتالیبی خۆیان بە سەراحەت و بە تەفسیل بۆ عوسبەت ئومەم بەیان بکەن، کوردەکان

چ نەوعە حکومەتێکیان ئەوێ (مەلەکی، جمهوری، پارلەمانتار) ڕەئیس وزەراو مەجلیس وزەرایان ئەبێ یان نا، ئایا ئەیانەوێ هەموو نەوعە مەسائێکی حکومەتی و گومرگ و پۆلیس، خەستەخانە، عەسکەریان ببێت، ئایا فکریان بەرامبەر بە مەلیك فەیسەڵ گۆڕیوە یان نا؟. ئایا موناسەبەت و عیلاقەی ئەو حکومەتەی کەوا تەشکیل ئەکرێت چی ئەبێت لەگەڵ بریتانیادا؟.

(ڕەمزی ئەفەندی) گوتی: فەخامەتتان ئەڵێن کە بەیانی (١٩٢٢) ڕابوردو کۆنە، حەق کۆن ئەبێ و نامرێ ئەم بەیانە بەکامیلی حقوق و ئیستیقلالی کورد بەیان ئەکات داوای تەتبیقی ئەکەین.

(حەمە ئاغا) گوتی: ئێمە کوردین و کورد عیبارەت نییە هەر لە سلێمانی. لەزاخۆ هەتا خانەقین هەمو کوردن، نایانەوێ لەگەڵ عێراقدا بژین، حکومەتێکی سەربەخۆی کوردمان ئەوێ لەژێر ئینتیدابدا. ئەگەر ئینگلیسیش نەماندانتێ موراجعەت بە عوسبەت ئومەم ئەکەین.

خیتاب بە جەعفەر پاشاش گوتی: فەخامەتتان چاك ئەزانن، کە حسیاتی میلەت بەنەوعێك چۆتە مێشکی عونسری عەرەب و کوردەوە، کە هیچ قوەتێك نییە لە ناوی بەرێ. ئیماکانی ژیانی موتەحیدەی بەینی عەرەب و کورد نیەو، لەمەولا ئیستیفادە لەیەکتر ناکەین. بۆ هەردولامان وا چاکە کوردستانێك لەژێر ئینتیدابی عوسبەت ئومەم بۆ کورد دروست بکرێ. چونکە ئەو ئینتیدابە بەنەوعێك عەرەبەکان ئیستیفادەیان لێ کرد کە لەزەرفی نۆ ساڵدا ئەیانەوێ ئیستیفتا لەحکومەتی بەریتانیا بکەن.. دیسان خیتاب بە مەندوبی سامی، حەمەئاغا گوتی: ئەو دەنگی کوردایەتیە تەنها مەخسوس نییە بە لیوای سلێمانی، کەرکوك و هەولێرو ئەوانیش هەرلەسەر عەینی فکرەن، بەڵام لەجێگای خۆیان لەژێر تەزیقات و فشاردان، ئەگەر بانگ بکرێنە سلێمانی ئەوانیش بە عەینی زمان و فکر داوای جیابونەوەو حقوقی کورد ئەکەن.

(جەعفەرپاشا) گوتی: تەشەکوری بەیاناتەکەتان ئەکەم زۆر مەسرورم کەلە قتعەیەکی عێراقا ئەهالی لەسەر غایەیەك وا ئیتحادی کردووە. لەبابەت بەیانی (١٩٢٢) ە وە ئەمەوێ بە سورەتی خسوسی قسە بکەم، چونکە ئەوەی کەمن سەلاحیەتی گوتنم پێ درابێ عیبارەتە لەو بەیانەی کە لەپێشەوە عەرزم کردن. وەکو ڕەمزی ئەفەندی ئەڵێ موعاهەدەی عێراق و ئینگلیس هەرچەندە لە (١٩٢٢)دا بەستراوە، فەقەت لە (١٩٢٤)دا لە لایەن مەجلیسی تەئسیسیەوە. تەسدیق و حەقی قانونی کەسب کردووە. لەو مەجلیسەدا مومەسیلی کورد هەبو. زۆر چاك لەبیرتانە لەژێر ریاسەت و ئیمارەتی شێخ مەحموددا ئیدارەیەکتان بۆ دامەزرابوو. لەپاشانا ئەهالی کەوتنە تەزەلم و شکایەت لە شێخ مەحمود، کە ئێستاش دڵم پێیان ئەسوتێ، حکومەتی عێراق ناچار بو بە ناردنی ئۆردو لەپاش (٣) ساڵ حەرەکاتی عەسکەری تەعقیبات بەدوای شێخ مەحموددا ئەوسا وەزعیەتی بۆ چاك کرا. ئەو بەیاناتەم خسوسیە تەنها بۆ تەنویری ئێوە ئەیڵێم.

(شێخ قادر حەفید زادە) گوتی: شێخ مەحمود فەردێکی ئەم میللەتەیە، میللەتی کورد (ابا عن جد) حورمەتی شێخ مەحمودی گرتووە. زوڵمی شێخ مەحمود بەقەدەر زوڵمی عیراق تەئسیری نەکردبووە سەر ئێمە کەوا پێی ڕازی نەبوین. ڕەئیس وزەرا گوڕز ئەکات ئێمە میلەتێکی سەربەخۆین لە ژێر ئینتیدابا حکومەتێکی موستەقیلی کوردمان ئەوێ ئەنا ناژین.

(ڕەمزی ئەفەندی) گوتی: ئەو حەقە کەبە میللەتی کورد دراوە ئەگەر شێخ مەحمود خەتای کردبێ دیسان میللەت قەباحەت بار نییە. مەعلومی فەخامەتتانە خەتای شەخسێك حقوقی قەومێك مەحو ناکاتەوە، شێخ مەحمود لەلایەن دوژمنانی کورد تەفرە درابوو، تەفرەدانی ئەو حقوقی کورد زەرەردار ناکات، بەڵام ئێوە ئەتانەوێ بەکەڕەتێ بمانکەن بە عەرەب.

(عزەت بەگ وەسمان پاشا) گوتی: میلەتی کورد تەنها عیبارەت نییە لە سلێمانی، زاخۆو خانەقین هەموی کوردەو هەمو کوردێك داوای حقی خۆی ئەکاو، هیچ کوردێك لەمەولا لەگەڵ عیراق ناژێ، بۆ جیاکردنەوەی حەقمان داوای ئینتیدابی حکومەتێکی منتدب ئەکەین، ئەگەر وایش نەی پرسی شکایەت ئەگەیەنینە عوسبەت ئومەم.

کورد حکومەتێکی موستقیلی لەژێر ئینتیدابدا ئەوێ. بە هەموو هێزمانەوە بۆ ئەو غایەیە کۆشش ئەکەین، ئەمجارە سیلاح و تفەنگمان، قەڵەم و موراجەعەت کردنە.

(ڕەئیس وزەرا) گوتی: لام وایە لە عیراق کوردەکان لە عەرەبەکان خۆشتر دەژین و حقوقیان باشتر مەحفوزە.

با یەکێکتان بڵێ کە فلان عەرەب غەدرێکی لێکردوین. کەچی هەموو مەشەقەت و جەفایەکیش کە ڕوی دابێ، بەسەر عەرەبەکانەوە بووە.

(مەجید ئەفەندی حاجی ڕەسوڵ ئاغا) گوتی: بەڵێ کورد دایم مەعروزی زوڵمی عەرەبەکان بووە، پار لە بەینی جولەکەو عەرەبەکانی فەلەستیندا شەڕبوو، عەرەبی عیراق بە یەکجار کەوتنە تەعزیەو ئەنواع موزاهەرات و مراجعات، کەچی ئێستا هاوخوێن و، براکانمان لە کوردستانی شیمال دا لەلایەن تورکەکانەوە سەرئەبڕێن، جەریدەکانی بەغدا بە ئاشکرا ئافەرین و تەقدیری تورکەکان ئەکەن و، شادمانی ئەکەن و هەڕەشەمان لێئەکەن و ئەڵێن: ئێمەش وەکو تورکەکان ئێوە ئەپلیشێنینەوە عەرەب لە تورك کەمتر نییە. بەغەیری ئەوەش ئێوە هەمو ساڵێك موعەلیم لە خاریجەوە بۆ منداڵەکانی عەرەب کە زەکایان زۆر لە کورد کەمترە، داخڵی بەعسات ئەکرێن، لەسەر مەسرەفی حکومەتی، کەچی تەلەبە کوردەکان لەسەر نەفەقەی خۆیان ئەچن لە بەغدا ئەخوێنن و، سەرەڕای ئەوەش

نمرەیان ئەشكێنن و، دوایان ئەخەن، ئەمساڵ (٥٠) تەلەبەی كورد پاش خراون كە هەمیشە لەپێش عەرەبەكانەوە بوون.

(رەئیس وزەرا) گوتی: بۆچی ئێوە نازانن كە جەریدەچی ئازادن، ئێوارەو بەیانی چەند جنێو بە حكومەت ئەدەن ئیمتیازی سیاسیان هەیە بۆ هەموو وێنە قسەیەك. تەلەبەش ئەوراقیان مەوجودە كەس ناتوانێ غەدریان لێبكات. لام وایە تەلەبەیەكیش بێ ئیستیحقاق تەرفیعی پێبكرێ بۆ خۆی و موجتەمەعەكەی بەهرەیەكی نابێ.

(رەمزی ئەفەندی) گوتی: یەك دەفعە عەرزمان كردن كورد و عەرەب بەیەكەوە نازین، ئێمە ئارین ئەوان سامین، ئێمە شاخین ئەوان دەشتەكی، هەتا خاكی عەرەبستان بێنە كوردستان و هی كوردستان بەرنە عەرەبستان، هەردوكیان لە شینایی ئەتۆرێن لە قابلیەتی زەراعەت ئەكەون.

(رەئیس وزەرا): ئەی توتنەكەتان بۆ كوێ ئەبەن.

(رمزی ئەفەندی): ئەیبەین بۆ ئەوروپا.

(رەئیس وزەرا): براكانم، بزانن كە لەدەماری منا خوێنی كوردیەتی تیا ئەجولێتەوە، هەرچەندە كەمن عەرەبیش بم، بۆ مەسلەحەتی ئێوە قسە ئەكەم. تكام وایە بە حسیات حەرەكات مەكەن، خۆتان مەكەن بە ئالەتی دەستی خەڵك، بەزەیتان بەخۆتانابێت، میللەتەكەتان بەبێ سود توش مەكەن. لە ناو توركەكان ئەوا برایەكتان لەسەر ئەو فكرە پارچەپارچە ئەكەن. لە هەمو دنیا مەعلومە كە كورد میللەتێكی دیندارە. دینیشتان عەرەبە، قورئان پێغەمبەرتان عەرەبە، فەیسەڵ كوری محەمەدە، براكانم تكاتان لێئەكەم فاجعەی كەربەلا تكرار مەكەنەوە.

(شێخ قادر): جەعفەر پاشا بە فاجعەی كەربەلا تەهدیدمان ئەكا، ئەبێ ئەوە بزانن ئەگەر ئینگلیس لە بەینا نابێ، عەرەب ناتوانێ پێ بنێتە خاكمانەوە.

(جەعفەر پاشا): رجا ئەكەم سوئی تەفاهم واقع نەبێ، مەبەستم تەهدید نییە.

(رەمزی ئەفەندی) هاتە پێشەوەو گوتی: پاشا دین، ئیمانمان ئەوەیە حكومەتێكی كوردیمان ئەوێ (ئەی خەڵكینە وانییە) هەموو بە كەرەتێ گوتیان: بەڵێ وایە.

ئەمجا (رەمزی) گوتی: پاشا ئەو قسانەت ناچێتە جەواڵی كوردەوە، ئەوە هەموی ئیخفالاتە بیخەرە جەواڵەكەی خۆتەوە.

(جەعفەر پاشا) گوتی: قسەكەت وەربگرە تۆ پیاوێكی تەحسیل دیدەی، لە ئیجتیماعێكی ئاوادا نابێ قسەی وا ناشیرین بكرێ.

(رەمزی) یش گوتی: تۆ قسەم نادەیتێ، لە سوئالەكانم گوریز ئەكەی، بلێ تەسلیم بووم.

(میرزا تۆفیق قەزاز) گوتی: ئێستاكە دیانەت مەوزوعی بەحس نییە، مەسەلە میللەتە، تەشكیلی حكومەتێكی كوردییە، ئەگەر بە دین بێ ئەبێ ئێرانیش واز لە میللەتی خۆیان بێنن و داخلی حكومەتی عیراق بن. ئەسەف ئەكەم لە مەوزوع دەرمەچۆ.

(جەعفەر پاشا) گوتی: قیاس (مع الفارق) كردن زۆر بێ مەنتیقیە ئێرانیەكان بە هەزاران ساڵ پێش ئەمرۆ تەشكیلاتیان بووە.

(میرزا تۆفیق): ئەگەر لەبەر دین لازمە ئێمە تابیعی عەرەب بین، لە هەموو عالەم مەعلومە كە كورد زۆر دین دارە، ئەگەر بەپێی دیانەت بێ ئەبێ عەرەب تابیعی حوكمی كوردبن.

(رەمزی ئەفەندی): حكومەتی عەباسی ئێوە بۆیە ئینقرازی كرد كە مەئمورینی تورك، كورد، فارس ی لەناو خۆیا ئیستیخدام كردبوو، ئیستیخدام كردنی مەئمورینی كورد بۆ ئێوە باش نییە. هەروەكو مەئموری عەرەبیش بونی لەناو كوردا موافق نییە.

(رەئیس وزەرا): تەشەكوری حسیات و تەوسیەتان ئەكەم كە لەپێش وقوعیا ئاگادارتان كردین.

ئەمجا مەجلیس هەڵسایە سەرپێ و لەناو ئیجتیماعەكەدا (سالاری مستەفا بەگی جەعفەر سوڵتان) هەڵساو بەناوی سادات و عولەماو مشایخ و عەشایری حدود كە داخلی عیراقن تەئیدی مەتاڵیبی كوردی كرد بۆ تەشكیلی حكومەتێكی كوردی سەربەخۆو، لە عەینی مەوزوعەوە مەزبەتەیەكی ئیمزاكراوی تەقدیم بە مەندوب سامی كرد.

لە ئاخری ئیجتیماعەكەدا لەلایەن (فەتاح ئاغای حەمەرەزا) ی رەئیسی هەمەوەند، كە لەلیوای كەركوك ساكنن، بە عەینی شێوە مەزبەتەیەكی تەقدیم بە مەندوبی سامی كردو، عەشیرەتی جافیش لەلایەن (كەریم بەگی فەتاح بەگ) تەمسیل كرابون ئەمجا لە پەنای ئەو مزاكەراتەدا، داخوازی كوردەكان بە مەزبەتەو بەیاناتی زۆر بە تەفسیل تەقدیم بە عوسبەت ئومەم و سەفارەتی بەریتانیاو پەرلەمانی ئینگلیس كراو، هەیئەتی ناو براو رۆژی (١٩٣٠/٨/١٢) بەبێ حسوڵی نەتیجەو هیچ ئیقرارێكی تەفاهوم گەرانەوە بۆ بەغداد، وەزعیەت شكلێكی زۆر پر لە تەشجیع و حەماسەتی وەرگرت. قەزای دهۆكیش بە نوسین هاواری خۆیان بە عوسبەت ئومەم و دارالاعتماد لە بەغداو پەرلەمانی ئینگلیس و رەئیس وزەرای عیراق راگەیاند.

**كوشتاری ١٦ ئەیلولی ١٩٣٠**

ئازادی خواهان لە سلێمانی بەتەواوی دەستیان دایە تەمەردو نەخشەی جیابونەوە. لەهەموو لایەكەوە دەوری ئیحساسات و تەشجیع بوو بە باو، بەبێ موازنەی ئموری پاشەرۆژ تێكرا تەڵەبی جیابونەوەو سەربەخۆیەتیان ئەرەپان.

كاپتن (گاون) موفەتیشی ئیداری پەنجەیەكی نهێنی خستبۆ ناو ئەو ئاژاوەیە. لە هەمو لایەك ئیتساڵ لەگەڵ عەشایرەكان كرابو، وەعدی تەواویان لێ وەرگیرابو كە هەتا ئاخر هەناسە بۆ ئەو هەدەفە تفەنگ تەقێنی بكەن.

موتەسەریفی سلێمانی (تۆفیق وەهبی) رەوتێكی مەدەنیەت كارانەی هێنابووە پێشەوە، بۆ جیابونەوەو تەشكیلی كوردستانێك تەحریكاتی عەلەنی دەست دابوێ. پاڵەوانان و پیاوانی ئەو

حەرەکاتی جیابونەوەیە عیبارەت بوون لە: حەمەئاغای عبدالرحمان ئاغا، شێخ قادر، حەفسەخان، تۆفیق قەزاز، مەجید ئەفەندی کانێسکان، شێخ محەمەدی گۆڵانی، عەزەت تۆپچی، مەعروف جیاووك، ئەورەحمانی حەمە پاشا، ئەحمەد بەگی فتاح بەگ، ڕەمزی فایەق بەگی بابان، عەزمی بەگ بابان و حاجی حەمەساڵح بەگ.

بەڵام لەرەغمی ئەو حسیاتە بەرزەی کە بڵاویان کردبوەوە، تەرتیباتێکی ئیحتیاتکارانەیان نەکردبو، تەنها بە چەپڵە ڕێزان و هوها ئەحۆڵەکەی سلێمانی ئەیان ویست ئیستقلال لە ٦٠ ملیۆن عەرەب بستێنن.

ئەو هەیئەتە داوای وەسائقێکی ئیمزاکراویان لە موفەتیشی ئیداری کاپتن (گاون) کرد، ئەویش وەعدی دانێ کە ئیستیشارە لەگەڵ حکومەتی بەریتانیادا بکات، فعلا چو بۆ بەغداد. لە گەرانەوەیدا بەو هەیئەتەی ڕاگەیاند کە حکومەتی بەریتانیا هیچ وەسیقەیەکی ڕەسمی نادا بە ئێوە کە موتەهەمی حکومەت بکەن، بەوەی کە لەلایەن ئەفرادی حکومەتی بەریتانیاوە ئەو ئیدیعایە دروست کراوە.

لازمە ئێوە بەبێ قەیدو شەرت داوای حقوقی خۆتان بکەن و، ئێمەش لە ڕێگای مەخسوسا کۆمەکتان پێ ئەکەین.

جا ئەو تەوزیماتەیان بو بە سەبەبی ئەوەی کە هەندێ لە خوێندەوارە حەساسەکان لەو ئاژاوەیە دڵ ساردببنەوە هەرلەو کاتەدا تێبگەن کەنەتیجەیەکی خراپیان لە پێشەوەیە. بەڵام لە رەغمی هێندێ ئینسباهات دەعوەتی عەشایرو لیوایەکانی تر کرا، کە مومەسیل بنێرن بۆ سلێمانی بەناوی جەژنی مەولودەوە ئیشتراکی هێندێ عەمەلیاتی جەوهەری سەورە بکەن.

فعلا لە هەموو لایەکەوە مومەسیلی کوردەکان حازر کرا لە مزگەوتی گەورە تەرتیباتی لازم لەو جەژنەدا بۆ یەکیەتی و ئیتحادێکی عومومی پێکهات. سلێمانی بو بە دوو بەرمیلی بەنزین و ئاگر و لەیەك نزیك بۆوە. قەزیەی ئینتخاباتیش لەو ڕۆژە شومەدا هاتە پێش. موتەسەریفی سلێمانی بۆ بڵاوەکردنەوەی هەندێ ئیحساساتی قەومی چو بۆ ناو عەشایری جاف لە ناوچەی هەڵەبجە.

کاپتن (گاون) موفەتیشی ئیداری، ئیدارەی سەرپەرشتی کاری موتەسەریفیەتیشی ئەکرد، دکتۆرو خەنجەر وەشێن هەرخۆی بوو.

مونتەخیبەکان عیبارەت بوون لە: (حاجی مەلا محی الدین، غالب ئاغا، فائق بەگی مارف بەگ، مەجید بەگی حاجی ڕەسوڵ بەگ و سەید ئەحمەدی داینەکە) کە ئەوانە سەر بە حکومەت بون و لە زدی ئەو حەرەکاتە بوون. لەلایەن حکومەتەوە جەلبی سەرا کران بۆ ئەوەی قەراری ئینتخابات بدەن بەو ئەعزیانەی کە حکومەت تەرشیحی کردبون بۆ ئەندامێتی پەرلەمانی عیراق. ئەمجا بە بڵاوبونەوەی ئەو خەبەرە دوکان و بازاڕ داخران. مەکتەبەکان چۆڵ کران، مەلاو فەقێکان لە مزگەوتەکان هاتنە دەر، ژنان پۆلپۆل کەوتنە ناو ڕیزی پیاوان، بەردەرگای سەرا بو بە ساحەی مەحشەر سەر چاپخانەی (حەمەئاغا) و بەردەرگای (تلخانە) و ئەترافی مەکتەبی سیاسی، بو بەجێگای خیتاب و گوتە خوێندنەوە.

تەلەبەو موعەلیمەکان هاتنە ڕیز، دەنگی نەشیدی شاعیرانی نیشتمان پەرست (زێوەر و بێکەس) یان لێ هەڵبڕی. (فائق بێکەس) بە کوڵە شیعرەوە بەناو موزاهەرە چیەکاندا ئەسوڕایەوە. یاوەری دەستی چەپ و ڕاستی (ڕەشۆل، حەمە سەعیدی دارتاش، محیّ الدین سالە سورو مەجیدی حەمامچی) بۆیان ئەلاواندەوە. ئەو ساحەیە بەتەواوی تەیری مردنی بەسەروە نیشتبۆوە، لە پێش خوێن ڕژانا خوێنی لێ ئەپژا، بەو تەرتیبە بە سامەوە عەینی تەمسیل و تەصویری (پروسیا)ی ئەکرد کە لەساڵی (١٨١٣) دا پەلاماری ناپلیۆن و فرانسیەکانیان دا. بەڵام فەرقی پرۆسیاو کوردەکان ئەوەبو، لەمان کەس واجباتی خۆی نەئەزانی چیەو کەس بە تەعلیماتەوە نەهاتبۆ ناو کۆمەڵی کارزارەوە. ڕەشاش و ئەسلەحەی دەستی پوارەکانمان تەنها ئەو خرکە بەردانەبون کە لە پەنجەرەکانەوە ئەیان گرتە کاپتن (گاون) و منتەخیبە کورد فرۆشەکان و جنێو و قسەی نابەجێ داوای جیابونەوەیان ئەکرد.

## دەنگێکی پڕ لەهەیبەت و ئاوازێکی پڕ لەسام.

مدیری شورتە مراد بەگ و معاون هەمزە شاسوار و ئامرفەوج محمود حلمی شامی و ئامر لیوا عەلی ڕەزابەگ عەسکەری ئەو هەیئەتە مسلەحەش تەرتیباتی مەسلەحەتی خۆیان کردبوو، چاوەڕوانی گڕی (قاب قوسین او ادنی) یان ئەکرد.

لەسەر داواکردنی کاپتن (گاون) سریەیەك عەسکەر لە سکنەی صلاح الدینەوە مسلحا هات بۆ سەرا، لە ناوەڕاستی ڕێگای سەراو ئەترافیا دامەزران، لەو ساتەدا پەنجەی موقەدەر دەستی بە پەلەپیتکەی دەمانچەی سەورەوە نا، یەکێك لەو سەربازانە بە گوللەی پوارەکان کوژرا.

ئەمجا لە هەموو لایەك ئەمر درا بە کوشتنی موزاهەرە چیەکان لولە ڕەشاشی پڕ لە ئاگری عەرەب ڕوی کردە سنگی ئەو نەوجەوانانەی کە بۆ داوای حەقێکی ئازادی خۆیان لەو ناوچەیەدا نەشیدی (پێشکەون.. پێشکەون) یان بەرامبەر بە واجباتی میللی ئەخوێندەوە. لە مەسافەی یەك دوو دەقیقەدا نزیکی (١٠٠) نەفەرێك بریندار و کوژرا، باقی پوراو موتەزاهیرینیش خۆیان شاردەوە.

لەعەینی وەختا کە ڕوحی ئەو شەهیدانە بەسەر ئاسمانی سلێمانی دا ئەگەڕا و، تەماشای ئەو خوێنە گەشەیان ئەکرد. کە بەهۆی گوللەی دوژمنەوە ڕژاوە و تك تك لە لاشەکەیان ئەتکێتەوە و بەسەر ئەو زەمینە ڕەنگاوەی بەر دەرگای سەرا کە ئێستا بەوێنەی ئەو خوێنە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ و ئاڵو واڵی لێ بەرهەم هێناوە.

زەعیم و قائیدەکانی ئەو پوارە و حەرەکاتە، ئەکسەریان لای خانمەکانیان خەریکی بادە نۆشی بوون و، بە بیجامەی نازەوە

حکایـەتی نـازەنینی خۆیـان ئەگێڕایـەوە، بێبـاك لـەو بەسـەرهاتە بەتەوژمەی کە بە پەنجەی ئەوان هاتۆتە ناوەوە.

ئەمجا حکومەت دەستی کرد بە گرتنی موسەببی تەحریکات و ئـەو فیتنەیـە. (حەمـەئاغا، شـێخ قـادر، مـیرزا تۆفیـق، عـزەت بـەگ، عەزمی بەگی بابان، ڕەمزی بەگ، فائق بەگی عەلی بەگ، ئاورەحمانی حەمە پاشا، مەجید ئەفەندی کانێسکان، حاجی حەمەصالح بەگ، شێخ محەمـەدی گـولانی و ئەحمـەد بەگی فـەتاح بـەگ) لـە زوعـەمای حەرەکەت و ئاژاوە زینـدانی کـران و، ئـەمجا حکومـەت دەسـتی دایـە گرتنـی تەبەقـەی ناوەنجی و تەلەبـەو گـەنجان، زینـدانی سـلێمانی پڕکرا لە بەندی.

لـەو وەختـەی کـە جـەنازەی شـەهیدەکانیان لـە سـالۆنی سـەرا لـە خوار قالدرمەکانی موتەسەریفیەت ڕاکێشابو، (تۆفیق قەزاز) یان برد بۆ زیندان، کە چاوی بە جەنازەکان کەوت، عەسەبیەت قومی گرت و، ڕوی کردە دائیرەی شورتەو عەسکەریە، گوتی: سـەگبابینە، چاکتان کرد ئەو قەسابخانەیەتان دانا؟

(مـەجید بـەگی حـاجی ڕەسـوڵ بـەگ) کـە سـەر بـە حکومـەت بـو، وەڵامی دایەو گوتی: ئەی تۆ باشت کرد بوی بە سـەبەبی ئـەو خوێن ڕێژییە..؟

لە عەینی ڕۆژا، قوماندانە خیلـەی ئینگلیس لە کەرکوکـەوە هاتـە



سلێمانی و ئەو ئەسیرانەی برد بۆ کەرکوك.

ئەمجا سلێمانی وەزعیـەتێکی پڕ لـە گریان و شیوەنی وەرگرت، بـەڵام ئـەوەی کـە زۆر هیمتـی کوردایـەتی لـەو ڕۆژەدا بەخـەرج دا، (حەفسە خانی نەقیب) بوو کە زۆر بە تەفسیل و بە ئیحتیجاجێکی زۆر (شـدید اللهجـە) ئـەو بە یاناتـەی بە تەلـەگراف دا بـە عوسـبەت ئومەم و سـەفارەتی بەریتانیا، موباشـەرەتەن لەگـەڵ جەعفەر پاشادا قسەی کرد. زۆر عەمەلیاتی (خارق العادە)ی بۆ تەسکینی میللـەتی سلێمانی و تەشجیعی ڕوحی قەومەکە نیشان دا.

تۆفیق وەهبی موتەسەریفی سلێمانیشیان کە بەموئەسیسی ئـەو حەرەکاتـە ئـەزانی بە حەپسی بـرد بـۆ بەغداو، لـەوێ فەسڵیان کرد هەتا ساڵی (١٩٣٧) ئیعتمادی تـەوزیفی نەخرایـەوە سـەر، (ئەحمـەد بەگ) کرا بە موتەسـەریفی سلێمانی، (حـاجی حەمەصالح بـەگ) لـە عەینی دەوردا کرا بە نائب، (ڕەمزی بـەگ) یـش کرا بـە قائیمقام و، زیندانیـەکانیش لـە دوای مودەیـەك بـە تەعەهـدی شەخسی بـەرەڵا کران.

(مـارف جیـاووك) یش بەهۆی ئـەو خوێن ڕێژیە کە لەسلێمانیدا کـرا، وەزیفەیـەکی شـازی چـنگ کـەوت، کـە ئـاخر وەزیفەکـەی موتەسەریفی سلێمانی و مودیری ئینحساری عام بوو. کە لەلایـەن (بابەعەلی حەفید زادە)وە لە ئەجری خیانەت و بەد (فکر) یەتەکەی بە عەزل کردنـی داو. تۆڵـەی ئـەو تەئسیراتە ئەحمەقانـەی لێکردەوە کە لەپـەنای ئیـستیقلالی کـوردا، لـەدەوری موتەسـەریفیەتەکەیا لـە سلێمانی لە ساڵی (١٩٤٥) دا بەئەنجامی هێنا.

جا بێ موازنەو بێ قابلیەتی زوعەماو ئەشرافی ئەو حەرەکاتە بو بـە سـەبەبی ئـەوەی کـە ئـەو خوێنـە ناحەقیـەی (٦/ئـەیلولی/١٩٣٠) بڕژێتن. بەری ئەو مزەکەرات و فکرەیە هەڵبوەرێنن کە لەمەو پێش لە عوسـبەت ئومەمـەوە قـەرار درابـوو، لەلایـەن حکومەتـەوە تەرسـیم کرابـوو. کـە ئەگـەر لـە تەریقەیـەکی فەعالانـەوە تـەعقیب بکرایـە نەتیجەیەکی باشـی لێ دەربکەوێ، بەڵام شەخسیەتی ئەو پیاوە بێ تەجرەبانـەمان بـو بەسـەبەبی ئـەوەی کـە هـەتا نیهایـەت ئـەو لکـەی خوێن ڕژانەمان هەر بەسەر دڵەوە بێ و، لە ڕەغمـی ئەو خوێن ڕژان و تەعەسـوبی عەرەبیەتـە، زەعـیم و قائیـدەکانی ئـەو حەرەکەتـەمان لەجیاتی تەشکیلاتی کوردستان و حەق ساندن ئەو شەهیدانەی کە لەبـەر دەرگـای سـەرا لـە خـوێن گـەوزیبون، مێشکیان بە شـەرارەی گوللەی معێدی جەیشی عەرەب پـرژا بو، کەچی (مع الاسف) حزبـی (اتحـادی دسـتوری و ئومـەی ئیـشتراکیان) بـۆ دروسـت کـردین و، لەپێناوی بەرز بوونەوەی (نوری سەعید و خەلیل کنەو سالح جەبر) هـەزاران عەیبـداری و بـێ مەسلەکیان هێنایـە سەرشـانی خۆیـان و قەومەکەیان، بەڵکو ناوی میللەتەکەیان بە شتێکی بێ قیمـەت و بێ مەسلەك و بـێ (مەبدء) خستە سەفاحەتی ڕۆژگارەوە. هەرچەند کە ئـەم میللەتـە ئیسپاتی قابلیـەتی خـۆی کردووە، بـە شەخسیەت و پارەپەرستی ئەو مرتجعەو وێنە شەخسانە مەرکـەزی خۆی ون ناکا،

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕوو شەرم و حەیایەکی ئەوێ کە ئەو خوێن ڕێژی و فکرەی لە بیر بچێتەوە، کۆمەك بەو شەخسانە ڕابوەستێ کە بون بەسەبەبی لەناوچونی بەخت و تەختی قەومەکەیان.

**شێخ مەحمود و شەڕی ئاوباریك**

شێخ مەحمودی بێچارە لەسەر قەراردادەکەی لەمەوبەری حکومەت لە ئێران دانیشتبو، حەرەکاتی غەڵەتی ئەیلولی ئەو ئاغایانە بو بە سەبەبی ئەوەی کە دیسان هەڵمەت بەرێتەوە سەر عەرەبەکان، تۆڵەی خوێنی ئەو شەهیدانە بکاتەوە. شیوەن و زاری کوڕ کوژراوو برا لێدراو شێخ مەحمودی ناچارکرد بۆ هاتنەوەی عێراق.

لەشکرێکی زۆری لە عەشایرەکان کۆکردەوە، هەمو مەنتیقەی سلێمانی دیسان خستەوە ژێر ئەشغالیەت. لەوەختێکا کەئەیەوێ لەلیوای کەرکوك بەر برێکی ئیتسالێ بەینی کەرکوك و سلێمانی بکات، خەتی ڕەئیسی حکومەت لە قسمی جنوبی کەرکوکەوە بخاتە ژێر سەیتەرەوە.

بۆئەوەی کە نیروی حکومەتی لە قسمی کەرکوك و سلێمانی و هەولێر بکەوێتە حاڵێکی سلب و یەئسەوە. بەو خەیاڵە پێ ئەنێتە مەنتیقەی ئاوباریك و لەگەڵ هێزێکی گەورەی عەرەب ئەکەوێتە شەڕ.

شەڕێکی قارەمانانە لەگەڵ ئەو لەشکرە زۆرەدا ئەکا لەپاش (٢٤) سەعات مقاوەمەت و کوشتارێکی زۆر دێتەوە لیوای سلێمانی. ئەمجا ڕوئەکاتە ناو عەشایرەکان بۆ کۆمەك و تەعاونکردنی لەشکر.

(مع الاسف) ئاغا یەکەم غیرەتەکانی عەشایر بەدەنگیەوە ناچن، هەتا (بابەکری سەلیم ئاغا) ڕەئیس عەشیرەتی پشدەری لە دێی (گرمکان) وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ: (یاشێخ نە بۆت ئەکەم و نە لێت ئەکەم). لە حەقیقەتدا بابەکر ئاغا لە ئاکامی عەشایرەکانی تر، ڕاستتر و سەریح تر وەڵامی دابۆوە، ئەمجا لە دوای نا ئومێدبونی لە تەعاونی عەشایرەکان، ناچار بو کە بەبێ قەید و شەرت تەسلیمی نەفس بە حکومەتی عێراق بکات و، بچێت لە بەغدا دابنیشێ.

ئەمجا لە هەمو لایەك هیواو ئامالی کورد پەردەیەکی نەگبەتی بەسەرا هات و شێردرایەوە. لەعەینی ساڵیشا (ئیسماعیل خانی سمکۆ) لەلایەن ئێرانێکانەوە ئیغفال ئەکرێ، گوایە ڕەزا شا ئەچێت بۆ شاری شنۆ لەوێ ملاقاتی ئەکات، هەر ئیملاکات و حقوقێکی کە لە ئێرانا هەی بێ ئەیداتەوە بەشەرتێ ئیعتیماد بکاتەسەر ملاقاتەکەی. ئەو کوردە خاوێن و دڵپاکە لەگەڵ (٢٠٠) نەفەری هەرکی و سورچی لە هاوینی (١٩٣٠) دا ئەچێتە شاری شنۆ بەڵام لەوە غافڵ ئەبێ کە هەمو کوچەو گوزەرو ماڵێکیان پڕ کردووە لە سەربازی ئێرانی.

ئیسماعیل خان لەگەڵ هەینەتێکا ئەچن بۆ ئیستیقبالی شا، بۆ ئەو شوێنەی کە قەرار درابوو ملاقاتی شای لێ بکا. کتوپڕ لەهەمو لایەکەوە دەستڕێژی لێئەکەن و لەناو باخێکا لەگەڵ چەند ئاغایەکی ڕەفیقیا شەهیدی ئەکەن و لەشکرەکەشی بەبێ چەك هەڵدێن. چونکە چەکەکانیان لە مەنزلەکانیانا تاقەت کرابو. دوا ڕۆژی ئەو ئاغا گەورەیەشمان بەو پێیە دوایی هات و ئێرانیەکان ڕەسمیان بڵاوکردەوە کە قاتلێ یانزە هەزار عەجەمیان لە شنۆ کوشتووە. بەڵام لەبەر ئەوەی تەفسیلاتی حەرەکاتی ئیسماعیل خان بەتەواوی نازانم بۆیە نەمویست تەداخل بە سیاسەت و حەرەکاتەکانی بکەم، وە ئیلا بەسەرهاتی ئەو زۆر لە قەزیەی شێخ مەحمود و قازی محەمەد گەورەترو واسع تر بووە، هەتا لەساڵی (١٩٤٦) دا لە ئێران داوای ئەسەریاتی حەرەکاتی ئیسماعیل خانم لە (تاهیر خان) ی کوڕی کرد، لە جوابا گوتی: هێندێ شتی نوسراوی ماوە، ئەگەر لە ئێرانا مایتەوە بۆت ئەنێرم، بەڵام (مع الاسف) لەو جارە زیاتر چاوم بە تاهیرخان نەکەوتەوە.

لەعەینی ساڵا شێخ سەعیدیش لەناو عەشایری دێرسیم دەست ئەداتە حەرەکاتێکی زۆر گەورە لە زدی حکومەتی تورك. داوای ئەو حەقە لەتورك ئەکات کە عوسبەت ئومەم بەکوردی ڕەوا دیوە. لە چەند خاڵ و مەرکەزێکی گەورەوە پێش ئەکەوێ و هێزێکی زۆری تورکەکان ئەسیر ئەکات، بەڵام لەبەر قەزیەی کوردی سوریاو جیابونەوەیان لەفەرەنسا، فەرەنسیەکان لە ژێرەوە موافەقەت لەگەڵ تورکیا ئەبەستن، کە هێزی تورك بە ئەرازی سوریادا تێپەڕ بکات بۆ سەر شێخ سەعید، چونکە لە داخلی ئەرازی تورك مەجالی ئەوە نامێنێ کە تورکەکان هێز بنێرنە سەر شێخ سەعید و، شێخ سەعیدیش لەو تەرتیباتی زاڵمانەیە ئەمین ئەبێ. لەناکاو ئەو هەمو سەربازە بێ ئیمانەی تورکی ئەگاتەسەرو، تەئسیراتی گەورەی تەیارەش بە تەواوی فرزەیان ئەبڕێ.

لەنەتیجەی مقاوەمەتێکی چەند ڕۆژیدا شێخ سەعید بەشەست ئاغای مسەببی ئەو حەرەکاتە ئەسیر ئەکرێ و ئەی خنکێنن و، پەنجا هەزار ماڵی کوردیش لەپاش چەند شەوو ڕۆژ، مەئزونی عەسکەرەکان لە کوشتن و ئەتك کردنی عائلەی جەنگاوەرەکان لە جێگاو شوێنی خۆیان ڕائەگوێزرێن بۆ شوێنانی تورکی زمان. بەدبەختی کورد هەر لەو ساڵە شومەدا دواڕۆژی شێخ سەعیدیش بەو پێیە هێنا.

لە عەینی وەختا (سەید تەها) ش لە قائمقامیەتی ڕەواندوز دەرکرا، ناچاربو تەسلیم نەفسی بە ئێرانیەکان کردەوە، بۆ تەسویەی ئیملاکات و عیلاقەجاتێکی کە لە ئێراندا هەیبوو، ئەویش لەلایەن ئێرانیەکان لەتاران زیندانی کراو، ئاخر ڕۆژی ژیانی لەژێر ئەسارەتی ئێرانیەکان دوایی هات.

ئەمجا قەزیەی کوردیەت و حقوقی لە هەموو لایەکەوە وەقفەی پێدرا، لە عەینی ساڵا حەرەکات کرایە سەر (جاف سلطان) لەنەزەر حکومەتا زۆر متەهەم بوو، بێ قەیدو شەرت ئەویش تەسلیم بە عێراق بوو، بەخۆی و کوڕەکانیەوە نێرایە کەرکوك. هەر لەو سەرو

بەندەدا ئیدارەی ناپاکی مەئمورینی حکومەتی ڕەشید صدقی، شێخ باقرو شێخ مەحمود و هێندێ لە شێخەکانی بەرزنجەی فیرار پێکرد بۆ ئێران پەناهەندەی ناو گڵباخی بون، حکومەتی ئێران بەهۆی ئەو مهاجەرانەوە، عەشیرەتی گڵباخی یەکیش کرد، بە سەدەهایان لەناو بەفرا ڕەق بونەوەو پەناهەندەی عێراق بون و شێخەکانیش عەفو کران.

ئەمجا کوردەکان لە سیاسەتکردن تەکینەوە، ئەو پەنجەیەی کە کوردی لە عێراق هان ئەدا، بۆ عەرەبەکان خرایە کار. عەرەبەکانی جنوب کە زدی حکومەت لە هەمو لایەکەوە تاویان دایە پورەو ئاژاوەنانەوە. بەناوی مەلەکیەت و سونیەت و بەعزێکیش بەناوی غەیری ئیستیقراری حکومەتی شەرعی لە عێراقا. لە ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٧ دا (محسن ابو التبیخ و عبدالواحد الحاج سکر خوام و شێخ سالح بحر العلوم) لە لیوای ناسریە و دیوانیە و نەجەف لەگەڵ حکومەتی عێراق کەوتنە شەڕ، مودەتێکی زۆر مقاوەمەتیان کرد، نەزەر بە عەدەمی ئیعتیمادی سەربازی عەرەب، حکومەت لە فەوجەکانی کوردی هەڵبژاردو، بە کوردەکان سەورەی ئەو شێخانەی لە دوای کوشتارو خوێن ڕێژیەکی زۆر دوایی هێناو شێخەکانی بە ئەسیر هێنایە سلێمانی و هەڵەبجە، لە دوای بەینێك ئەو مسەببە گەورانەی خوێن ڕێژی عەفو کران و کران بە نائب و ئەرازیەکی زۆری حکومەتیان بەسەردا دابەش کردن، چونکە عەرەب و خۆماڵی بون، هیچیان پێ نەگوترا و هیچیشیان لێنەکرا.

جا بەڕاستی ئەو قەومانەی کە داوای سەربەخۆیەتی و جیابونەوەیان کردووەو ئەیکەن هەرچیەکی لەو ڕێگایەدا کە بەسەریان بێ نابێ بە زەحمەتی بزانن و لێی بتۆرێن، چونکە چاکەی قەومیەت و سەربەخۆیەتی ئەوەیە کە شێخەکانی عەرەبی جنوب بەسەریان هات.

لە عەینی ساڵ معاهەدەی (سەعد ئاباد) لە بەینی ئێران و عێراق و ئەفغانستان لەزدی کوردەکان لە تاران بە ئیمزا گەیشت. لە هەمو لایەکەوە کورد خرایە ژێر تەدابیری لە ناو بردن.

### بەکر سدقی

لە ئەوەڵی ساڵی (١٩٣٧) دا جەعفەر پاشا وەزیری دیفاعی عێراق نەزەر بەو سوئی تەفاهومەی کە لەبەینی (بلاط) و حکومەتا هەبو، لەسەر ئیشارەتی (بلاط) و مەلیك غازی لەلایەن بەکر سدقیەوە لە (قراخان) کوژرا، کە لە عەینی وەختا چ جەعفەر پاشا و چ بەکرسدقی هەردوکیان کوردی خەڵکی دێی (عەسکر) ی ناحیەی (ئاغجەلەر)ی لیوای کەرکوك بون، بە تەئسیراتی ئەو حەرەکاتی جەیش و بۆردومانی تەیارە، وەزارەتی (یاسین الهاشمی) سقوتی کرد.

جەعفەر و یاسین هاشمی و عەلی ڕەزابەگ لەناوچون. وەزارەتی حکمت سلیمان هاتەسەر حوکم. تەها هاشمی و نوری سەعید و ڕەشید عالی فیرارەن عێراقیان بەجێهێشت. ئەمجا تەپڵی (بەتەڵی باسل) بۆ بەکر سدقی لێدرا.

بەکر سدقی لەگەڵ کوردەکانا پەنجەی تێکەڵ کردەوە، پشتیوانیەکی تەسویری کوردی لە ئەمسالی (تۆفیق قەزاز) محمود جەوت، ڕەشید جەودەت، فائقی کاکە ئەمین، تۆفیق وەهبی، ئەمین ڕواندوزی، حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغا، شێخ قادری سیامەنسوری لە خۆ کۆکردەوە. بۆ بینای ئامالیەت و کوردایەتیەك کەوتە سەر خولیایەکی نەختێ ئاشکرا، لەگەڵ دکتۆر (گروپای) سەفیری ئەڵمانیا لە بەغداد دەستی تێکەڵکرد، وادەرکەوت کە پارەیەکی زۆریشی لە ئەڵمانیەکان وەرگرتبێ بۆ سازکردنی حەرەکاتێك لە وەختی لزوما، وا بڵاوکرابۆوە کە (تۆفیق قەزاز) یش ئیستیفادەی لەو پارانە کردبێ.

بەناوی ڕەئیسی ئەرکانی جەیشەوە تەسەڵتێکی تەواوی بەسەر بلاط وشکڵی حکومەتیدا پەیدا کردبو، هەتا مەلیك کەوتبۆ مەترسی ئینقیلابێکی عەسکەری بەچەنگ بەکر سدقیەوە هەر بەناوی ئیختیلات و ئیعتیمادی ئەڵمانیەکانەوە ژنێکی ئەڵمانیشی هێنابو. لە (١١/ئابی/١٩٣٧) دا بۆ سەرپەرشتی موئتەمەرێکی عەسکەری لە (تراقیا) لە تەرەفی حکومەتەوە ئەنێردرێ بۆ تورکیا. لە تەیارەخانەی موسڵ لە لایەن جوندیەکی فیدائی عەرەبەوە، بە تەئسیر و یارمەتی ئەحمەدعەزیزی تەیارەچی خەڵکی سلێمانی و ئەمین یا مولکی و مەحمود نەدیم زابتێکی عەرەبەوە لەگەڵ محەمەد جواد ئەکوژرێ.

بە کوژرانی بەکرسدقی وەزارەتی (حکمت سلیمان) سقوتی کرد، (جەمیل مەدفەعی) هاتە سەر کار و وەزیرە فیراریەکان هاتنەوە بۆ عێراق و، تەپڵی ئەڵمان خواهی نەختێ دابین بو.

### تەشکیلاتی پشدەر

بەرامبەر بە میساقی (سەعد ئاباد) مانەوەی پشدەر خیلافی قەرارداد و دڵخوازی تورك و ئێران بو، لەلایەن (مەجید یەعقوب) ی موتەسەریفی سلێمانی نەخشی حەرەکاتی پشدەر درا بە وەزارەت، کە لەو وەختەدا پشدەر بەرامبەر بە حکومەت سەدێکی پۆڵاین بو.

لە وەزارەتی (مەدفەعیدا) لە مانگی تەموزی (١٩٣٨) حەرەکات کرایە سەر پشدەر، عەشایری (جافە ڕەشکە و شیلانە و مەرگە و بتوێن) لێی هەڵگەڕانەوە، لە نەتیجەی مشاوەرات و لێکدانەوەیەکی زۆر لەلایەن ڕوئەسا و کۆمەڵی ماقوڵنیانەوە (بابەکرئاغا و عەباس ئاغا) ی ڕەئیس دەستەبەر بون کە قبوڵی تەشکیلات بکەن، بەشەرتێ:

١-عەسکەری ئیجباری لە مەنتیقەی پشدەر نەگیرێ.
٢-لە سیلاح تەجرید نەکرێن.
٣-تەسجیلی نفوسیان نەکرێ بەبێ ڕەغبەتی خۆیان.

٤-بەبێ ڕەغبەتی خۆیان نەبێ مدیرەکانیان لە وەزیفە دەرنەکرێن.

ئەمجا بەو تەرزە تەشکیلاتی پشدەر کراو، لەهەمو لایەکەوە ئاڵای حکومەت لە مەراکزی ئیدارەی پشدەر لەرایەوە. لەدوای مدەتێك مدیرەکان نەقلی شوێنانیان پێکرا. لەسەر ئەوە (خدری حاجی ئاغا و باپیری بابەکر ئاغا) ئیختیفایان کرد و، بە مناسەبەتی شەکری تەموین و کوتاڵی دزی کۆبون لە (١٩٤٣-١٩٤٧) تەسجیلی نفوسیش کران و، لەهەمو لایەکەوە پەنجەی تەفرەقەیان بۆ خرایە کار. ئەملاکاتی قەزای ڕانیە و شاربازێر و ناحیەی ماوەتیان لێساندنەوە. (حاجی عەباس ئاغای سلیم ئاغا) بە تەئسیری زوڵم و فشاریەوە لە مەنتیقەی دۆڵێ و ناحیەی ماوەت دەرکرا.

(ڕەشید عەولاً ئاغا و مەحمودی قائیمقام و سەعیدی وەسمان ئاغا) ش لە دێهاتی (سورەقەڵات و تەگەران و گرگاشە) دەرکران.

(عەباسی مەحمود ئاغا) کە لە پشدەر مەرکەزێکی شاز و هەڵکەوتوی هەبو لەدوای نەمانی ئەو پشدەر شکڵێکی هەرەجو مەرەجی وەرگرت. (بابەکر ئاغا) کە پیاوێکی جیهاندیدە و پیلان ئازمودە بو لەلایەن کوڕانی (حاجی ڕەسوڵ ئاغا و باپیری بابەکری مەحمود ئاغای نورەدینەوە) خرایە ژێر فشار و دعایەو شکایەت بازی.

بەهۆی تەفرەقەوە، پشدەر قیمەتی پێشوی خۆی لە هەمو لایەکەوە زایع کرد، سیاسیا و ئیجتماعیا مەرکەزی پشدەریەکان تا ئەندازەیەك بەبێ ئەهەمیەت مایەوە و، مەعاشی ڕوئەساکانیش یان لەدەوری (جلال خالید) موتەسەریفی سلێمانی لە (١٩١٥)دا قەتع کراو، بەهەمو مەعنایەکەوە نفوزی حکومەت لە پشدەرا پێشکەوت و پشدەریەکان پاشکەوتن.

### ڕەشید عالی و حەرەکاتەکەی

لە ساڵی (١٩٣٩) دا کە ڕەشید عالی هاتەسەر حوکمی وەزاری، سەرجەم موسەببانی کوژرانی جەعفەر عەسکەری و یاسین هاشمی و موئەیدینی حەرەکاتی بەکر سدقی لە ناو برد.

(مەحمود جەودەت) کە قاتڵی (محمد سنەوی) بوو بە ئیشارەتی بەکر سدقی، مەحمود سنەوی کوشتبو، لە (دارالشفا) دەرهێنراو ئیعدام کراو، (حکمت سلێمانیش) بەتوهمەتی شیوعی حوکمی ئیعدامی درا و پێنج ساڵ حوکمی ئەشغال شاقە هێنرایە سلێمانی هەتا ساڵی (١٩٤١). ئەمجا دائیرەی ڕەئیس وزەرا بو بە جێگای موستەشاریەتی هتلر. بەغدا بو بە بەرلین و ڕۆما.

کە ئیعلانی حەرب لە بەینی ئەڵمان و ئینگلیس کرا، دائیرەی عەسکەری بەتەواوی ڕویان کردە سیاسەت کردن.

جەیش دەورێکی خەتەری سیاسەتی وەرگرت. نەسیحەت و بە بەسەردا هاتنی باش لە نەزەر جەیشا دوژمنایەتی بو.

عەریفێك و ڕەئیس ئەرکانێك چونیەك شوڵیان لە ئەسپی سیاسەت هەڵکێشابو، قەرارگاکانی جەیش لە باروتخانەیەکی نزیك بە ئاگری ئەکرد، بەکەمترین بڵێسەی تەعلیمات گرفەی ئەساند.

لە ڕەغمی ئەوەی کە ئینگلیسەکان بەو حەرەکاتەی ڕەشید عالی دڵگیر بون و چەند دەفعەش لەلایەن وەصی عێراقەوە نەسیحەتی رشید عالی کرا، بەڵام بێ سود بو، ڕەشید عالی لە داری سیاسەت و ئینقیلاب نەئەهاتە خوارێ، بەڵام ئەو جارە ئیستیقالەی کرد و مودەتێك بە ئارامی دانیشت.

### بەیانی وەصی عێراق لە (١٤/تەموزی/ ١٩٤١) دا

لە ئەیلولی (١٩٤٠) کە ڕەشید عالی بو بە ڕەئیسی وزەراو وەزیری داخلیە، ئیختیلاف لە بەینی بلاط و ڕەشید عالی دا لەسەر دو شت پەیدا بو: یەکەم: لەسەر سیاسەتی داخلی، چونکە ڕەشید عالی ئەیویست تەداخل بە هێندێ عەمەلیات بکات کە ئەوانەش سوئی تەسەرف بون لە موختەلیفی شئونی دەوڵەتا. دووەم: ناردنی وەزیرانی عێراق بۆ خارج بەمەبەستی تەفاهم لەگەڵ ئەڵمان و ئیتاڵیا، بێ موافەقەت و مەسڵەحەتی مەجلیسی وزەراو مەعلوماتی بلاط و مەعلوماتی وەزیری خاریجیە.

هەر لەسەر ئەو شتانە لە وەزارەتا مخالەفەت لە بەینی نوری سەعید و ناجی شەوکەت پەیدا بو. ڕەشید عالی ئەیویست نوری سەعید لە وەزارەتەکەیا نەمێنێ. فعلا لە (٢١/کانونی دووەم/١٩٤١) دا نوری سەعید لە وەزارەتی خاریجە ئیستیعفای دا، کە شروت وابو ناجی شەوکەتیش، ئیستعفا بکات، بەڵام ڕەشید عالی نەیهێشت ناجی شەوکەت یش ئیستعفا نەکرێ.

لە ڕۆژی دووەما تەرتیباتێکم دامەزراند کە هەموو وەزیرەکان ئیستعفا بکەن، فعلا وەزیرەکان ئیستعفایان دا، تەنها ڕەشید عالی و ڕەئوف بەحرانی مانەوە.

مادە (٦٤) ی دەستور ئەڵێ: موجودی وەزیران نابێ لە (٩) وەزیر زیاتر و لە (٦) وەزیر کەمتر بێ، بەپێی سەراحەتی مضادی قانون وەزارەتی ڕەشید عالی و بە شکڵێکی غەیرە قانونی مایەوە، چونکە بەخۆیەوە دو وەزیر مابونەوە.

منیش (وەصی) حالا ئیستعفای وەزیرەکانم قبوڵ کرد، بۆئەوەی کە لەنەزەر مەجلیسی نەواب و ئەعیانا مەعلوم بێ کە وەزارەتی ڕەشید عالی غەیرە شەرعیە. ئەمجا بانگی ڕەئیس ئەرکانی جەیش و مدیری شورتەی عامم کرد، کە ئیتاعەی ڕەشید عالی نەکەن. چونکە وەزارەت و ئەوامرەکانی شەرعی نییە.

لەو وەختەدا ئامر قوەی جەوی مەلەکی (عەقید محمود سلمان) بە مەندوبی جەیش هاتە لام و گوتی: لەلایەن ڕەئیس ئەرکانی حەرب چوار ئەرکانی تر ڕاسپێردراوم کە نابێ ڕەشید عالی لە وەزارەت دەربچێ، و ئێمە قبوڵ ناکەین.

منیش گوتم: مانەوەی ڕەشید عالی خیلافی دەستورەو مداخەلەی زوبانیش بە سیاسەت خیلافی ئادابی ئینزیباتییە ئەمجا وام بە موافق زانی کە ئەو چوار ئەفەرە بانگ بکەمە بلاط و قسەیان لەگەڵدا بکەم، فعلا هاتنە بلاط. منیش صدری مەجلیسی ئەعیان (محمد صدر) م بانگ کرد، کە قسەیان لەگەڵدا بکات و واز لەو فکرەیە بێنن، لە جوابا گوتبویان لەسەر قسەی خۆمان مسرین، ئەگەر ڕەشید عالی لە وەزارەت دەربچێ بەغدا ئیحتلال ئەکەین و، خۆم ملاقاتی ئەو چوار زابتەم کرد، بەڵام نەسیحەتیان بێ سود بو.

محمد صدرم نارد بۆ لای ڕەشید عالی کە واز لە فکرەیەك بێنێ خیلافی دەستور بێ، بەڵام سودێك لەو نەسیحەتەدا نەبو. محمد سلمان لە عەینی وەختا ئیرادەیەکی مەلەکی لەلای ڕەشید عالیەوە بۆ هێنام کە ئیمزای بکەم. بۆ تەعینی عەلی محمد و یونس سەبعاوی بە ئەندامی وەزارەت. بۆ ئەوەی کە وەزارەتەکەیان ببێ بە چوار ئەفەر هێندێ ئیقدامات لەزدی من بکەن، چونکە ئەو دوو وەزیرە زۆر ئەڵمان خواز بوون.

ئەمجا کەزانیم لەوە زیاتر خودداری باش نییە، نوری سەعید و ناجی شەوکەتم لە وەزارەت دەرکرد، عەرائیزی باقی وزیرەکانم بۆ ڕەشید عالی ئیعادە کردەوە، وەزیفەی ناجی شەوکەت و نوری سەعیدم بە عومەر کەزمی و ناجی سویدی سپارد.

ڕۆژی دووەم زابتەکان هاتنەوەو گوتیان: ئەگەر عەلی مەحمود و یونس سەبعاوی ئەکرێن بە وەزیر، وەزعی تۆ خراپ ئەکرێ، ناچار ئەمرم دەرکرد بۆ تەعینیان، لەبەر ئەوەی کە مەجلیسی نەواب حسی بە مخالەفەتی من و ڕەشید عالی کردبو، هێندێ سوئالیان لەو مەوزوعە لە ڕەشید عالی ئەکرد، بەڵام جوابیان وەرنەگرتەوە.

ئەمجا ڕەشید عالی داوای حەلی مەجلیسی لێکردم، بەڵام لەبەر نەبونی ئەسبابی جەوهەری و لەبەر نامساعدی میزانیە، موافەقەتم لەسەر قسەی ڕەشید عالی نەکرد، ڕەشید عالی ئیسراری لێکردم کە ئەبێ هەر ئەمرۆ مەجلیس حەل بکەم، گوایا مەجلیس ئیهانەتیان کردووە ئەگەر حەل نەکرێ بەیانی ناوێرێ بچێتە مەجلیس، منیش داوای مۆڵەتم لێکرد بۆ عەسر، بۆ ئەوەی فکرێك لەو مەوزوعە بکەمەوە، لەدوای ڕۆشتنی ڕەشید عالی چوم بۆ دیوانیە و بەو فێڵە ڕەشید عالی کەوتە بەینی ئەمری واقیعەوە، یا ئەبو بێت بۆ دیوانیە، یا ئەبو بچێتە مەجلیس، ئەمجا ناچار بو هەر ئەو شەوە ئیستیقالەی خۆی بە بەرقیەی دامێ، منیش فورا ئیستیقالەکەم قبوڵ کرد.

ڕەئیس وەزارایەتیم بەرەو ڕوی تەها هاشمی کردەوە لە ڕۆژی (٣١/مارتی/١٩٤١) دا لەسەر تەعەهدی مەجلیسی وزەرا، مەجلیسی نەوابم داخست، چونکە مودەیان تەواو بو بو، لە ئەوەڵ شەوی نیسانی (١٩٤١) دا لەخەو خەبەر کرامەوە، کە جەیش دەورەی بلاط ی گرتووە و بۆ گرتنی من هاتبون، بە گورجی هەستام دیوارم کون کرد، چومە ناو شاری بەغدا، خۆم لە ماڵی پورم شاردەوە، ڕۆژی (٣/نیسانی/١٩٤١) چوم بۆ بەسرە، لە فشاری ڕەشید عالی و زابتەکان خۆم دورخستەوە، لە خارجی عێراق لەگەڵ نوری سەعید و جەمیل مەدفەعی یەکترمان گرتەوە.

١٤/تەموزی/١٩٤١

ئەمجا لە دوای ڕۆیشتنی وەصی و هاتنە سەر حوکمی ڕەشید عالی (شەریف شەرەف) کە یەکێك بو لە فامیلی هاشمی کرا بە وەصی عەرشی عێراق و، لەزدی ئینگلیس ئیعلانی تەمەرد و موشاغەبە کرا. بەناوی ڕەئیسی جەلیلەوە ڕەشید عالی ناوی بەرزکرایەوە. لە هەمو لایەکەوە بەرقیەی تەئیدی بۆ بەرز ئەکرایەوە، لە ٣/مایس/١٩٤١ دا بە ناوی ئەوەی کە ئینگلیس ئەیەوێ لە هندستانەوە لەشکر بێنێ و بە ئەرازی عێراق تێپەڕی کات بۆ ئەفریقا بۆ بەرهەڵستی ڕۆمل و زەخیرەی عێراقیەکان و خواردنی ئەو لەشکرە بێ سامانە بدات و عیراق لەم ڕوەوە ببێ بە ساحەی حەرب.

بۆ نەجات دانی عێراق لەو بەڵایانە، بەو ناوەوە ئیعلانی حەربی لەگەڵ ئینگلیسا کردو، (مفتی) فەلەستین (ئەمین الحسین) و (فەوزی قاوقچی) سورییایی کە ئەمانیش بە تەرزی نەفی لە عێراق دائەنیشتن، بۆ عەینی فکرو غایە بون بە هاوفکری ڕەشید عالی. ئەمجا ئینگلیسەکانیان لە هەمو لایەکەوە لە سەفارەتخانە حەپس کردو ئینگلیسەکانی دەرەوەشیان بردنە ناو زیندان. لەشکریان کردەسەر (شعیبە و حەبانیە) ئیستحکمات و تەیارەخانەکانی ئینگلیسیان خستە محاصرەوە لە هەمو لایەکەوە ڕێگای تجوالی ئینگلیسەکان قەدەغەکرا. بەعسەی جیهاد ئێردا بووە هەموو قەزاو ناحیەیەك، ئاڵای ئیسلامی و تەپڵ و دەفی موشایەخ و قورئان و حەدیسی مەلاکان کەوتە ناو. خوتبەو تەلقینیان لە هەمو لایەکەوە دەنگی ئەدایەوە.

بە عیبارەتی خوارەوە مەلا مستەفا حاجی مەلا ڕەسوڵ کە مەلایەکی مەشهوری سلێمانییە، بۆ تەشجیعی ئیسلامیەت و ئیشتراکی جیهاد لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی لەحزور موجتەمعینێکی زۆر گەورەدا، لە سەروبەندی حەرەکاتی ڕەشید عالیا، خوتبەی ئەخوێندەوە و ئەیگوت:

وەالله ئەچم، یاالله هەر ئەچم، تا الله هەر ئەچم، بەخۆم و دوانزە تەلەبەی عیلمەوە، ئەچم بۆ ئەو غەزایە، هەرچوم و ناگەڕێمەوە، هەر ئەچم، لەو کەنەش هێمەوە هەر ئەچم.

کەچی فعلا داوای چونی لێکراو نەشچوو، لەمە سەیر تر ئەوە بو کە مەلا کاکە حەمەی ڕەباتی ئیمام و خەتیبی چوارتا تەلەگرافێکی موباشەرەتەن دابو بە ڕەشید عالی بە عیبارەتی خوارەوە:

بۆ ڕەئیسی جەلیل حکومەتی عێراق

تەبریکی موەفەقیەتتان ئەکەم، بەخۆم و عەشیرەتمەوە حازرم بۆ ئەو جیهادە موقەدەسە کە خۆمی تیا شەهید بکەم.

مەلا کاکە حەمەی چوارتا

کە لە عەینی وەختا هەر خۆی و مێزەرەکەی لەشکرو عەشیرەتی بو.

جا هەر بەو دەستورە ئەشخاسی بێ بەسیرەت دەستیان دابو سەر مشاغەبەی ئیسلامیەت و، بەزمانی عەشایرەکانەوە بەرقیەی تەئید ئەنوسرا بۆ ڕەئیسی جەلیل و بە ئیزاعە بلاو ئەکرایەوە. خاوەن ناویش لە ئیمزاو بەرقیە بێ خەبەر بو. لەبەر تەتەوری ناسکیش نەئەوێران تەکزیبی ئیمزاکانی خۆیان بکەنەوە.

هەتا ئیسماعیل شاویس کە قائیمقامی ڕانیە ئەبێ، بەزمان عەشایرەکانەوە لەسەر حسابی بەلەدیە ئەنواع بەرقیەی تەئید بۆ ڕەئیسی جەلیل ئەنوسێ، وەختێ کە زەمان و ڕۆژ تەبەدلی کرد، ئاغای عەشایرەکان تەکزیبی ئیمزاکانی خۆیان کرد، لەسەر ئەوە مامۆستا شاوەیس نەقلی مەحمور کراو هەر بەو تەئسیرە ئیستیغنا لە خەدەماتی کرا.

تەیارەکانی ئینگلیس (وشاش و مەعەسکەر الرشید) یان بۆردومان کرد و، تەلەفیات و کوشتارێکی زۆر لەلایەن عێراقیەکانەوە ڕوی دا. بەلام لەبەر ئەوەی کە عەشایرەکانی جنوب بەو حەرەکاتە مەسرور نەبون لە هەمو لایەکەوە ساردییان هێنایە پێشەوە. لە ڕەغمی ئەوەی کە چەند تەیارە و چەند موهەندیس و ئەعزای عەسکەری و نەوت لە ئەلمانیاو ئیتالیاوە واردی عێراق بوبون. لە کەرکوك محافەزەی نەوتەکەیان ئەکرد، لەگەل ئەوەشا عەشائیرەکان هەر بەپەنجەی ئینگلیس هەلگەڕانەوە و ئینگلیس ئیستعمالی قوەتی کرد. لە حدودی (رتبە، حدیثة، خلیج) و ئۆردوی هێنا بۆ عێراق.

لە (٢٩/مایس/١٩٤١) دا داخلی بەغدا بو، هەمو بەلاغە درۆکانی ئوارەکانی تەکزیب کردەوە. ڕەشید عالی ئەمجا بە ناچاری لەگەل مفتی فەلەستین و هێندێ لە هاورێکانی ئیلتیجایان بە ئێران کرد بە مناسەبەتی هاوپەیمانییەتیان لەگەل ئەلمانیا. ئەمجا لەسەر ئیدعای جامیعەی عەرەبی لەدوای سقوتی ئەلمانیا، ئەمین الحسین لە فەرەنساوە هێنرایەوە فەلەستین و لە تیاچونی فەلەستینیشا بەناوی جەمعیەتی مەنکوبینی فەلەستین چو بۆ میسر و پاکستان و سائری ئەقطاری ئیسلامی بە ملیۆن دیناری سەند، بەلام ڕەشید عالی لە ئیحتیلالی بەرلین دا ڕوسەکان زۆر بۆی ئەگەڕێن ، چونکە نەزەریەی ڕوسەکان بەرامبەر بە ڕەشید عالی زۆر خراپ بو، لەدو جهەتەوە بەزدی مەبادئی خۆیانیان ئەزانی، بەلام بە هەر وەسیلەیەك بێ خۆی گەیاندە حیجاز و بە حجەتی (فمن دخلە امنا) لە حجاز مایەوە. لە ڕەغمی ئەوەی کە لەلایەن ئینگلیس و عێراق داوای ئیستردادی کرایەوە. گوێیان نەدایە تەسلیم کردنەوەی، بەلام ئەملاکاتێ کە ڕەشید عالی لە عێراق هەیبو، خرایە بارمتەی خەزێنە لە موقابیل ئەو زەرەرو زیانەی کە لە خەزێنەی داوە.

لە لایەن مەحکەمەی عەسکەری عێراق لە (٦/کانونی دووەم/ ١٩٤٢) دا (عەلی محمود شێخ عەلی و یونس سەبعاوی و سەلاح الدین سەباغ و فەهمی سەعید و محمود سلمان) بە مادە (٨٠-ق-ع.ب) فەقەرەی ئەوەل حوکمی ئیعدامیان دراو، (ئەمین زەکی) ڕەئیسی ئەرکانی جەیشی عێراقی ش بە (٥) سال حوکم مەحکوم کراو، ئەوانەش کە بە مسبب و موشتەرکینی حەقیقی ئەزانران فەسل و مەحکوم کران.

قەزیەی جولەکەش لە بەغدا شکلێکی زۆر وەحشیانەی وەرگرتبو، ئەو ڕۆژەی کە لەشکری ئینگلیس نزیکی بەغدا ئەبێتەوە عەرەبەکان پەلاماری جولەکەکان ئەدەن، پۆلیس لە جوندی و جوندی لە ئەهالی زیاتر دەست ئەکەن بە کوشتن و ئەتکی جولەکەکان، لە هەمو لایەکەوە پەلاماریان ئەدەن و بوغازەو دوکانەکانیان ئەشکێنن، لە مالآنا سەریان ئەبڕن و تالآنیان ئەکەن، بەڕاستی ئەو وەحشەت و بەربەریەتەی کە لەو ڕۆژەدا عەرەبەکان دەرحەق بە جولەکەکان کردیان، ئەگەر قەومی کورد هەزاریەکی ئەو بەسەرهات و حالەو وەحشیانە عەمەلیاتێکی لێ ببینرایە باوەڕ نەئەکراو، هەتا نیهایەتی عالەم ئینسان لەبەر بەدناوی کورد ڕوی بهاتایە سەر هەلبڕێ، بەلام چونکە ئەم کارە کردەوەی حکومەتێکی سی سالآنەی متەمەدنی وەکو عێراق و عەرەبییەت بو، لەلایەن ئەو حکومەتانەی کە مراقەبەی مەدەنیەتی عێراق ئەکەن هەر باسیشی نەکراو، ئەو هەمو کوشتار و ئەتکو فەزیحەتەی کە بە حکومەتی ئینگلیسیش کرا، بە مناوەرەی عەسکەری و بە شەڕ و جەنگ ناوی نەبراو بەرامبەر بەو تەعدا گەورە و کفرانی نیعمەتەی کە لە ئینگلیس هەلگەڕابونەوە هیچ نوعە تەکلیفێکیان نەخرایە سەر، کەچی شێخ محمودی بێچارەو مەلا مستەفای هەژار و حەمە ڕەشید خانی بێ تاوان هەزار یەکی ئەو جرمە گەورەو مجرم و گوناهبار نەبوون کەوا ئیستیقلال و سەربەخۆی ١٥ ملیۆن کوردیان بە توهمەتی عەیبداری ئەوانەوە توقیف کردووە. لە هەمو مناسەبەتێکا بە چاومان دا ئەدەنەوە کە تەشکیلاتمان بۆ شێخ مەحمود دروست کردووە.

ئەمجا لە عەینی ڕۆژا (ئەرشد العمری) ئەمین عاسمەی بەغدا ئیستقبالی ئۆردوی ئینگلیسی کرد و، ئارامی کەوتە ناو شارو، جەمیل مەدفەعیش تەشکیلاتی وزاری کردەوە ئەمن و ئاسایش هاتەوە جێی خۆی.

(عەلی کەمال) بە مالەوە هاتبۆوە بۆ سلێمانی و (ماجد مستەفا)ش بۆ پیلانێکی غەیرە مەعلوم هاتبۆوە بۆ سلێمانی. بە تەدابیری (ماجد مستەفا و عەلی کەمال و بابە عەلی حەفید زادە و ئیبراهیم ئەحمەد و سالح قەفتان و ئەحمەدی عەزیز ئاغا و میرزا تۆفیق) وا بە موافق زانرا کە لەو وەختەدا کە لەشکری عێراق مەشغولی حەرەکاتە، حەرەکاتێك بکرێتە سەر ئەو قوەی پۆلیس و عەسکەرانەی کە لەقەزا و ناحیەکانی لیوای سلێمانی و هەولێر هەیەو، داوای جیابونەوە لە عێراق بکەن و سەربەخۆیەتی کورد بێننە مەیدانەوە.

لێرەدا دوو نوقتەی حەساسیان گرتبۆ بەر نەزەر:

١-ناجح بونی ئینگلیس لەو بەسەرهاتەدا .

٢-تێکدانی حکومەتی عێراق و تەوجیهی عەتف بەسەر کوردەکاندا.

فعلا بۆ تەتبیقی ئەو پرۆگرامەی شەوی (٩/مایسی/١٩٤١) لە ماڵی حەمە ئاغا هەیئەت کۆبۆوە، لە نەتیجەی کۆنگریسا قەرار درا کە حەمە ئاغا بچێ بۆ پشدەر، قیام بە عەشایری پشدەر و ڕانیە بکات. حەمە ئاغا ڕۆژی (١٠) ی مانگی ناوبراو چو بۆ پشدەر، لە دێی (چۆمەخر) کە مولاقاتی بابەکر ئاغا و عەباس ئاغای پشدەری کردبو، (ئەحمەد تەق) یش کە لەو وەختەدا موعتەمید و نوسندەی عەباس ئاغا ئەبێ لەگەڵ بابەکری محمود ئاغادا، ئیشتراکی موزاکەرەکەیان ئەکەن و، ئیتفاق حاسڵ ئەبێ کە لەهەر سەعاتێك کە حەمە ئاغا وەڵام بنێرێ حەرەکات بکەن بۆ سەر قەڵادزێ و شارباژێر و سلێمانی. هەروەها چاوپێکەوتنی سوار ئاغای پیران و کاکە باسی ڕەئیسی عەشیرەتی ئاکۆ ئەکات بەعەینی لەهجەو دەستور بەڵێنی حەرەکات وەرئەگرێ و، بۆ باقی تەرتیبات ئیتیساڵ لەگەڵ حەسەن ئاغای ڕەئیس مەنگوڕی زودی و کانەبی باڵوڵ ئاغای مەندەمەرەو کورانی حەمە ڕشید ئاغای نۆرکێ ئاورەحمان ئاغاو حەمە ئەمین ئاغاو حامد بەگ و حسن بگ و ئەحمەد بگ هەڵەبجەو داود بگ کریم بەگی کلاری جاف و محمودی فەقێ مەحمەدی هەمەوەند ئەکات مەقاولەو بڕیار هەموو لایەکیان وادەی ئەدەنێ.

لەلایەکی تریشەوە فەخری واسف بەگ ئەنێرێ بۆ شەقڵاوە بۆ لای ئەمین زەگی بەگی وەزیر بۆ ئیستیشارەو حسوڵی موافەقەت ئەویش بەعەینی ڕێگا بەلایەوە باش ئەبێ.

لە هەموو لایەکەوە جواب بەموافقی وەرگیرایەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەعاملی ئەساسی پورەو ئینقلابیان تیا نەبوو، ئەو هەیئەتی موئەسەسەی ئەو فکرەیە لەو پیاوانە نەبوون کەهیچ کامێکیان دەست لەخۆشی و سامانی خۆیان هەڵبگرن و پەلاماری ئەو فکرە بدەن بەبێ تەرەدوودو پاشە ڕۆژ لێکدانەوە. لە نوقتەی دووەمیشا لەو جەمعیەتە هیچ کامێکیان دەستەبەری ئەوە نەبوون کە بۆ یەکێك ئیعتراف بکەن کەبرا گەورەی کارەکە بێ، بۆ ئەوەی کەهیچ نەبێ یەکێك مەسئول بێ لەجەمع ئاوەریو کۆبونەوەو ئیستیشارەو تەنزیمی موخابرات و پیلان بلاوکردنەوە.

لەبەر موی ڕەزەوەو مناقشەی بێ لزوم مەرکەزی کارەکەیان بۆ تەسبیت نەئەکرا. چونکە بینای ئیشەکە لەسەر شەخسیات و بۆ ئیستیفادەی وەزائیف و پارەو مەوقع چنگ کەوتن دانرا بوو. ئەوەکو بۆ جیابونەوەو ئیستیفادە لەفرسەت و ڕۆژ.

بەڵام موتەسەریفی سلێمانی زۆر کەوتبۆ دەهشەتەوە ئەگەر سەپەرشتی ئەو فکرە بەباشی کرابایە موتەسەریفەکە حازر بوو کە سلێمانی بەهەموو قوەتێکەوە تەسلیم بکات.

جا موتەسەریف ئەهمیەتی موضوعی دابو بەوەزارەت و حکومەتی ڕەشید عالی. ئەما بەهاتنی چەند تەیارەیەکی ئەڵمانی ئەو هەیئەتە لەم فکرە باشە ساردبونەوەو، وەقفەیان لە کارەکە کرد بۆ موازەنەی ڕەوشەنی مەسیرو جەرەیانی ئەڵمانیەکان لەتەداخلی عێراقا. بەڵام وا دەرکەوت کە ڕەشید عالی لەو حەرەکاتە مەترسی پەیدا کردبێ ئەگەر شێخ مەحمود بە قسەی ڕەشید عالی نێرابێتەوە بۆ سلێمانی بۆ تێکدانی ئەو فکرو ئیتیفاقە بووە.

هەرچەندە بەنەزەریەی زۆر موئەیدە کە شێخ مەحمود بۆ تێکدانی ئەو بیرە هاتبێتەوە بۆ سلێمانی، بۆ ئەوەی کە بەناوی دینەوە جەمع ئاوەرێك بکات.

ئەگەر بەغداش بگێڕێتەوە ڕشید عالی لە شیمال دفاع بکات هەتا ظهوری ئەو ئامالەی کە قیامی بۆ کردوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە شێخ مەحمود خۆی بەوە موعتەریف نییە، مەیدانی حەقیقەت و باوەڕ تەسلیم بە پەنجەی ئەسرار ئەکەم و ئەو مەوزوعە بە ڕاست دانانێمو هیچ قەرارێك بۆ ئەو باسە نانووسم، چونکە هەروەکو ئەو شکلەی لێ ئەکرێ، ئەو فکرەش موئەیدە کە بڵێین ئنگلیسەکان ئیشارەتی شێخ مەحمودیان کردبێ بۆ فیرارو بۆ حەرەکاتێك بۆ ئەوێ، کەلەسازمانەکانی جیهانیدا تەحقیق بکات کە حەرەکاتی عێراق بەرەغبەتی قەومەکە هاتۆتە وجود، لە نوقتەی دووەمیشا زەغت و تەئسیراتێ کەبەسەر شعبیەو حبانیەوە هەیە سوك بکرێ یا هەر مومکنە بۆ بینای قومیتەتێك هاتبێتەوە وەکو خۆی بلاوی کردبۆوەو ئەیویست بیکا.

### شێخ مەحمودو فیراریەکەی لەساڵی ١٩٤١دا

شێخ مەحمود لەگەڵ (محی الدین سالحە سووری) پیاوی لەژێر موراقەبەی شورتە لەبەغداوە فیرار ئەکات بەرەو سلێمانی، لە ٢٢/مایسی ١٩٤١ بەئەوەڵ گەیشتنەوەی بە لیوای سلێمانی دەستی کرد بەلەشکر کۆکردنەوە.

حاجی عەباس ئاغای پشدەریو ڕەشید عەولا ئاغاو سەعیدی وەسمان ئاغاو مەحمود ئاغای تەگەران و حەمە ڕەشید ئاغای نۆرك و قادر ئاغای موبرەو شێخ حەمە سەعیدی نەزارەو شێخ حەمە ئەمین خوینانەو شێخەکانی مردەلۆخەی قەراخ و شێخەکانی کونەپوشیو پێنجوین و کوێخا دێهاتیەکانی ناحیەی سورداش و عەربەتی لێ کۆبوونەوە.

لەبەر ئەوەی کە زروف مساعد بوو بۆ ئەنواع تەعلیقاتی گرنگ و چەور، خەڵك لە هەموو لایەکەوە بە دەنگ شێخەوە ئەهاتن، (سیتەك) کرا بە مەقەڕی شێخ.

زەخت خرایە سەر قائیمقامی چوارتا (عەلی سەروەت بەگ) بەڵام عەلی سەروەت خۆی بەیەکێك لەلەشکرچییەکانی شێخ دائەنا، هەتا نیهایەت بێ حورمەتی شەخسی پێ نەوترا.

شێخ مەحمود لەپێش هەموو ئیقدامێکی ملیدا بۆ مەساڵحی حاجی عەباس ئاغاو ڕەشید عەولا ئاغا مەجالی دا کە حەرەکات بکرێتە سەر دێی (وەڕان) بۆ سەر کوێخا ڕەسول و کوێخا مەجید. فعلا پشدەریەکان بە ئیستیفادەی فرسەت چوونە سەر ئەو دێیە

،کوێخا ڕەسول و چەند پیاوێکی وەرازیان کوشت. وەرازیەکانیش چەند ئاغایەکی پشدەرییان لەو شەڕەدا سەرەنگری کرد، وەراز سوتاو تالان کرا.

ئەو مەوزوعە چاوی خەڵکی کردەوە کە دیسان ئەو حەرەکاتەش وەکو حەرەکاتەکانی جاران هەر سوتان و کوژرانە، عاتیفەو پێشکەوتنی تیا نییە. پیاوە ژیرەکان بەرە بەرە تەکینەوە. بەڵام سەربازە کوردەکانی جەیشی عێراق لە هەموو لایەکەوە تەعەسوبی قەومی بە تفەنگەوە فیراری پێ ئەکردن بۆ لای شێخ.

ئەمجا شێخ محمود لەگەڵ ئینگلیسەکان بابی مخابەرەی کردەوە، بۆ ئەو حەرەکاتەی کە دەستی داوەتێ و سەرف مەتڵەبی خزمەتی ئینگلیس و کوردایەتییە.

لەپاش ئیستیقراری وەزعیەت حکومەتی عێراق مدیری عامی داخلیە (شێخ مستەفا قەرەداغی)ی بۆ مواجەهەی شێخ ناردە ئەزمەڕ. شێخ بەو مەعاش و قەرار دادەیە ڕازی نەبووبوو کە حکومەت ئامادەی بە ئەنجام گەیاندنی بوو. ئینگلیسیش هەموو مەرامێکی لەگەڵ حکومەتی عێراقا پێك هاتبوو مائلی ئەوە نەبوو لەوە زیاتر لە عێراقدا ئاژاوە هەبێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە تەعەسوب



لەناو لەشکرەکەی شێخا زۆر بوو بۆ گیرانی سلێمانی، شێخ لەتیف لە ئەزمەڕەوە بەبەرقیەی هلیوگراف ئینزاری حکومەتی سلێمانی کرد بۆ تەسلیم کردنی سلێمانی، حکومەتی سلێمانی شکلێکی زۆر بەسامی وەرگرت و لە هەموو لایەکەوە ئیستحکاماتی لازمە لەناو شارو ئەترافیا کرا بۆ مدافعەی پەلاماردان.

حەقیقەتەن لەپێش ئەو ئینزارەدا گیرانی سلێمانی زۆر ئاسان بوو، بەڵام بە ئینزار کردنی حکومەت جەیش مەوقفی دیفاعی تەنزیم کردو، حکومەتی ئینگلیس ئینزاری شێخ محمودی کرد کەواز لەو حەرەکاتە بهێنێت، حکومەتی عێراقیش بە مفادی خوارەوە ئەم بەیانەی بڵاوکردەوە.

**بەیانی ڕەقەم (١)**

بەپێی ئەو سوڵتەیەی کە بەو دوو ئیدارەی مەلەکیە کەمورەقمی بە (٤٠٠,٣٩٢) و موئەرخن بە (١٤ تموزی ١٩٤١) و بە مادده (١٣) لە مەرسومی ئیدارەی عورفی ساڵی (١٩٣٥) ئەمر بەمانەی خوارەوە ئەکەم:

١-هاتوچۆنەکردن لە داخلی قەسەبەی سلێمانی لە سەعات دەو نیوی زەوالی ئێوارەو هەتا سەعات سێی بەیانی.

٢-نزیك نەکەوتنەوە لە سوکنات و مەعەسکەرات و موئەسەساتی عەسکەری و مەقەرات و مەطارات، ئیلا بە ئیجازەی سوڵتاتی موختەسە نەبێ.

٣-چەك و سیلاح هەڵ نەگرتن لە داخلی شاری سلێمانی دا.

هەر کەسێ موخالەفەی ئەو نوقاتانە حەرەکات بکات یان بەسێ ساڵ حبسی و یان سەدو پەنجا دینار جەزای لێ ئەسێنرێ بەپێی مادده (١٥) لە مەرسومی ئیدارەی عورفی.

عقیدرکن

قائد قواتی عەسکەری لە سلێمانی

ئیدارەی عورفی

شێخ مستەفا قەرەداغی کە هەلێکی باشی بۆ هەڵکەوتبوو کە بکرێ بە موتەسەریفی سلێمانی، بەو ئامال و هیوایە پیلانەکانی لە شێخ محمود تێکدا، بەخاوە خاوی هاتوچوو تەمسیلی مومەسلەیەتی لەبەینی حکومەت و شێخ مەحمودا. مەوقیفی شێخ مەحمودی تەنك کرد.

عەشائیرەکان کە زانیان ئەو حەرەکاتە خیلافی روغبەتی ئینگلیسە لە هەمو لایەك لە شێخ تەکینەوە، شێخ تەنها لەگەڵ چەند قاچاخ و عەسکەری فیراری مایەوە. هەرچەندە کە تەشکیلاتێکی ناوخۆیان دامەزراندبو، بەڵام ئەویش تێکچو.

قادر ئاغای موبڕەیان ناوزەد کردبو بە قائدی قواتی عام و شێخ ئەحمەدی ڕشەوی بە مدیری شورتەی عام و شێخ حەمە سەعیدی نەزارە، بە مدیری حەرەکاتی پێنجوێن.

بە هاتنی شێخ مستەفا قەرەداغی بۆ سلێمانی بە مەنصەبی موتەسەریفی، ئیشەکانی شێخ محمود هەموی پس پس کرا، ئەمجا شێخ مەحمودیان ئیجبار کرد کە قبوڵی ئەو شروتانەی خوارەوە بکات:

١-شێخ محمود بچێتە داری کەلی دابنیشێ، بەبێ ئەمری حکومەت داری کەلی جێنەهێڵێ.

٢-شێخ لەتیف بۆ مدەتێك بچێت لە بەغدا دابنیشێ.

٣-واز لە ئیشێك بێنێ کە خیلافی رەغبەتی حکومەت بێ.

٤-ئەو مەعاشەی کە لە بەغدا وەری گرتوە لە داری کەلیش هەر وەری بگرێ.

٥-ئەو عەسکەرانەی کە لە وەحداتی خۆیان فیراریان کردوە یان تەسلیمیان بکاتەوە یان رایان نەگرێ.

فعلا شێخ مەحمود چو بۆ داری کەلی و شێخ لەتیفیش نێردرا بۆ بەغدا. بەلاّم شێخ لەتیف لەدوای سێ مانگ بە فیراری هاتەوە بۆ شارباژێر و لەلایەن حکومەتەوە عەفو کرا.

بەلاّم بەناوی حەرەکاتی شێخەوە ئەم شەخسانە مەحکوم کران. بعضا بە محکومیەتی سندوقی ضمان، بعضا بە محکومیە قەتعی زندان. لە شەش مانگەوە هەتا ساڵێك حوکمیان بەسەردا درا لە دیوانی عورفیدا؟

١-شێخ لەتیف دانساز ٢-حەمە سەعید بەگی جاف تەحسیلداری بەلەدیە ٣-عبدالقادر تەحسیلداری بەلەدیە ٤-محمد خدر کاتبی تاپۆی سلێمانی ٥-حەمە بۆر موزەمیدی صحە ٦-مەلا جەلالی حیدەری سەعاتچی ٧-شێخ ئەحمەدی رشەوی ئێران ٨-شێخ حمە سەعید نەزارە مالك لە ناحیەی پێنجوێن ٩-خەلیفە یونس رەئیسی روخزایی جاف مالك و سکرەی شارەزور ١٠-عەبدوڵا جوهەر شاگردی مەدرەسەی ثانەوی ١١-ئیبراهیم گوردی موعەلیم.

عەسکەرە فیرارەکانیش بەرەلاّ کران کە بەبێ پشتوو پەنا بسوڕێنەوە.

دیسان لەو سەفەرەشدا کوردەکان لەگەڵ شێخ مەحموددا بەموافقی نەبزوتنەوە، لەوەختێکا کە شێخ محمود واردی بووە، بۆ ئیتیفاق و رێکی و تێگەیشتنی فەلسەفەی ئەو حەرەکاتە، عزەت بەگی عوسمان پاشاو میرزا تۆفیق قەزاز بەتەمسیلی حەمە ئاغاو هێندێ لە ئەشرافی سلێمانی چوون بۆ سیتەك، بەلاّم متأسفانە هەردوو تەرەف نەیان توانی بو، لە رێگایەکی بێ کینەو غەرەزکارانەوە تەفاهمێکی حەقیقی بە ئەنجام بگەیەنن.

هەتا نیهایەت ئەو ئەشرافانە مەعاونەتێکی فکری شێخ مەحمودیان نەکرد، بەڵکو هەدەفەکەیان لە شێخ محمود تێکدا. هەروەکو خۆیان یارمەتی شێخیان نەدا پروپاگەندەی خراپیشیان دەرحەق ئەکرد، عەباسی مەحمود ئاغای پشدەریان لێ تەحریك ئەکرد کەلەزدی حاجی عەباس ئاغای پشدەری هێندێ مەتاڵبی سەیر بەرامبەر بەشکانی سیاسەتی شێخ محمود بدا بە حکومەت.

شێخ محمود لەو هەلەشا هیچی بۆ نەکراو هیچی پێ نەبرا، قەزیەی کوردەکان لەو فرسەتە باشەشدا دیسان هەر بەبێ ئامانج و مەسلەحەت دوای هات.

ئەمجا شێخ محمود رووی کردە کەسابەت و موڵك زیادکردن، بعضا تجاوەزاتی حەقی ئەشخاسیشی نەهێنایە پێشەوە. لەگەڵ حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغاو عەربەتی و هەمەوەندو بازیانیەکان دەستی دایە شکایەت و تەعەدا، بەناوی عظیی مستملکەیانەوە لەهەموو لایەکەوە عەرائزی شکوایان لەزدی شێخ مەحمود لە ئیدارەجاتی حکومەتیدا ئەسوڕایەوە.

تالان و تفەنگ پێوەنان و خەرمان سووتان لەلایەن شێخ لەتیف و شێخ مەحمود بوو بەشتێکی واقعی و ختەی مەرسومە.

## کانی بەردینەو حەمە ئاغاو شێخ محمود

بەحیجەتی ئەوەی کەدێی کانی بەردینەو قازانی ناحیەی سەرچنار موڵکی شێخ مەحمود بوون و لە غیابی ئەوا لەلایەن حەمە ئاغای عبدالرحمن ئاغاوە تەسەروف و تەجاوەزی حدودیان کراوە، زەکات و مالکانەی ئەو دوو دێیە بە زۆر ئەستێنێ و لە غەیری ئەوەش پیاو ئەنێرێ لەسەر مەرزی (ئاوبارە) لە رێگای (کانی گۆمە) تفەنگ بە حەمە ئاغاوە ئەنێن ئوتومبێلەکەی کون ئەکەن.

حەمە ئاغاش لەگەڵ حەمە ئاغای ئیسماعیل ئاغای شێوەکەڵ و عارف قەرەچەتانی و سەعە چەتە تەقە لە پیاوەکانی شێخ ئەکەن. (شێخ حسێن بەردە زەردی کەرئیسی چەتەکانی شێخ ئەبێ بریندار ئەکرێ، لەسەر ئەو جەرەیانە حەما ئاغا لەشکر کۆئەکاتەوە کە بچێت بۆ سەر شێخ محمود، بەلاّم حکومەت تەداخل ئەکات تەرەفەین مەنع ئەکات لەو تەجاوەزاتە.

بەو مناسەبەتەوە من لە چوارتاوە ئەسبابی ئەو لەشکرکێشی و حەرەکاتەم لە حەمەئاغا پرسی ئەویش بە نوسراوی خوارەوە وەلاّمی دامەوە:

### خۆشەویستم میرزا

کاغەزت گەیشت تەشەکوری حسیاتتان ئەکەم، قەزیەی ئێمە وەکو بۆتان مەعلوم بووە وایە، لەو رۆژانەدا جەنابی شێخ حەرەکاتێکی ناشیانەی کرد، موقابل بە حەرەکاتەکەی ئەمەوێ حەقی خۆی پێ نیشان بدرێ.

بۆ ئەم خسوسە خزمان و دۆستان هەموویان بە ئیخلاسەوە سوێندخۆرو ئامادە بوون بۆ ئەو غایەیە، جەماعەت عیبارەتن لە رونەساو پیاوی شەریف و ناسراو، کەس نەماوە کە ئیشتراکی ئەو کارە خێرە نەکات.

لەشکرەکانمان ئەمانەن:

١-حەمە ئاغای عەلی ئاغای پشدەری.

٢-باپیری بابەکری محمود ئاغای پشدەری.

٣-حەمە ئاغای عەباس ئاغای گەلاڵەی پشدەری.

٤-ئەورەحمان ئاغاو حەمە ئەمین ئاغای سیوەیل.

٥-خەلیفە یونس.

٦-شێخ یوسفی شەدەڵە.

٧-حامد بەگی جاف.

٨-شێخ فەتاحی کوڕی شێخ عصام الدین ناحیەی سورداش.

٩-حەمە عەلی ڕۆستەم.

١٠-محمودی فقێ محمد هەمەوەند.

١١-ئەمین ڕەشید ئاغا هەمەوەند.

١٢-زۆر ئەشراف و متنفزین کە حازرن ئەو پیاوە خوێن مژە لەناو بەرن. بەڵام حکومەت مانعی ئەو لەشکرکێشییە.

ئیتر خۆشیت

محمد عبدالرحمان ئاغا زادە

١٩٤٢/١١/١٤

لەسەر ئەو مەوزوعە شێخ بابە عەلی حەفید لەناو بازاڕی سلێمانی. لە خەلیفە یونس ئەدات لەسەر ئەوەی کە ئەکسەری حەیاتی لەگەڵ شێخ محمود سەرف کردوەو، ئێستاش لەزدی ئەمان بۆتە دەستەی ناحەزەکانیان.

فعلا حکومەت مەنعی تەجاوەزاتی شێخ مەحمودو حەمە ئاغای کردو بەیەکەوە ئاشت بوونەوە، شێخ مەحمود، حەمە ئاغای خەڵات کردو، هەتا ئەو تەئریخە تەفاهم لەبەینی شێخ مەحمودو حەمە ئاغا لە دەرەجەیەکی مناسب دا بوو.

## توتنەکانی من

لە ڕەغمی ئەوەی کەمن زۆر خۆم بە موخلیسی ئالی حەفیدان ئەزانی و لەزۆر کاری سیاسەت و جەمعیەتا هاوفکریو خزمەتگوزاریم کردون، لە ساڵی ١٩٤٤ کەلەوەزیفەی حکومەتی دەرچووم، لە شارباژێر دێی (بناویلەم) ئیجار کرد توتنم لێکرد، لە دوای تەواوبونی توتنەکانم، شێخ لەتیف ناردبوی لە مزگەوتی بناویلەدا (١٢) فەردە توتنی (سامون) کەوەزنیان (١٢٠٠) کیلۆ بوو لەگەڵ بەعزێك خام و بلوری و خەوراو تەلیس-یان دزی بووم.

بۆ ئیستردادی توتنەکانم چووم بۆ داری کەلی بۆ لای شێخ مەحمود، شێخ مەحمود کە چاوی پێ کەوتم هەڵیکێشا، دەمانچەکەی کە بمکوژێ، بە هەزار کلکە لەقەو (اللە خوای و ناوی خوا) خۆم ڕزگار کردو بەم مزکراتە دوایی پایانمان بەزیارەت و چاوپێکەوتن هێنا:

شێخ مەحمود: بۆچی هاتوی بۆ ئێرە حەقت چیە بەسەرمەوە.

میرزا: یا شێخ (١٢٠٠) کیلۆ توتن و هێندێ ئەشیای کەم لەلایەن شێخ لەتیفەوە بەتاڵان براوە هاتوم بۆم وەربگریەوە.

شێخ محمود: تۆ موستەحەقی بە خراپە لەگەڵ کردن، کتێبێکت داناوە بەناوی (جیهانێکی بەپێکەنین) شێخ قادری برام خوێندویەتەوە، زۆر تەعەدای شەخسیت کردووە، شێخ مستەفا قەرەداغی ئەو کتێبەی تۆی کردووە بە شمشێرو لە هەموو مەجلیسێکا لە بەغدا شعرەکانت ئەخوێنێتەوەو شێخی پێ تەحقیر ئەکات و، تەعدای حەقی و دیانەتیشت کردوە، تۆ زۆر بێ دینی.

میرزا: بەڵێ، من ئەو کتێبەم داناوە، بەڵام لەزدی ئێوە قسەم نەکردوە، من تەنقیدی ئەو شێخانەم کردوە کە بەناوی تۆ بەو ئیرشادەوە دەورێکی خرافەتیان هێناوەتە پێش و کوردیان لە تەیاری تەمەدون شاردۆتەوە. من شخصا ئێوە بە شێخ نازانم، بەڵکو معتەریفم بەوەی کە ئێوە زەعیمی کورد بوون و بەو ناوە زۆر ئەزیەت دراون. تەئەسوف ئەکەم کە تۆش خۆت بەو شێخانە ئەزانی کە دەستپڕی و سحرو جادویی ئەکەن.

شێخ محمود: مەعلوم مەبەستت ئەوان بووە؟

میرزا: بەڵێ، یا شێخ لەوە سەیر تر ئەوەیە شێخ قادر حەوت ساڵ بوو خەنجەرێکی دابومێ، ئەم ساڵ لەسەر ئەو مەوزوعە لێی ساندومەوە، توخوا لە غەیرەز شێخ کەسی کە شتی وای کردووە.

شێخ محمود: ڕاستە، بە لەتیف ئەڵێم توتنەکانت بداتەوە.

خولاسەی وتار هەتا منیش لە تەعەدای شێخان ڕەهایم نەبو، بە نرخی ئەو حەلە بایی (٥٠٠) دینار توتنم فیدای مقاسدی شێخ لەتیف کرا لەجیاتی حەقی دۆستایەتی و برایەتییەکی قەومی.

## عەربەت

ساڵی ١٩٤٨ عەربەتییەکان لەژێر نفوزی شێخان هەڵگەڕانەوە، ئەملاکاتی مەخصوبەیان بەهۆی دائیرەی تەسویە بۆ ئیعادە کرایەوە، شێخ لەتیف (٣٨) خەرمانی مدعیەکانی بەیەك شەو سوتان، ئەو مەوزوعە تەئسیرێکی زۆر ناشیرینی کردە سەر نفوزو بێ دەسەڵاتی حکومەت، هەتا حزبی شیوعی عێراق لە بەسراو کەربەلا موزاهەرەیان ئەکرد، ئەمەیان گوت حەقی برا عەربەتییەکانمان ئەوێ.

تێبینی:

ناونیشانی بابەتەکە دەستکاری کراوە

سەرچاوە:

حقائقی بەسەرهاتی شێخ مەحمود لەپەنای ئیستقلالی کورددا، میرزا امین مەنگوڕی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٣ سلێمانی.

## نمونەی ڕۆشنبیریی گشتی

# هەنگاوێك بۆ سەركەوتن

میرزا مەنگوری

**بە ڕەهبەری وتەی بەناوبانگەکانی جهان**

**سەرەتا:**

**مەبەس لەدانانی ئەم کتێبە تەنها دوو شتە:**

١-بە ئەندازەی دەسترسی خۆم گەلێ کۆششم کرد بۆ تەماشاکردنی گۆڤار-مجلە-و ڕۆژنامە، و لەم وردبونەوەیەشمدا، چەند وتەی تأریخیی جوانم چاو پێ کەوتبی، خێرا هەڵمگێڕاوەتە سەر کوردی و گردم کردۆتەوە، لەدواییدا هات بەسەرما کە بیکەم بەگوڵدەستیکی ئەدەبی بچکۆلە جگەلەوە کە قسەی پیاوە گەورەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوام تیدا کۆکردۆتەوە، بەرامبەر ئەم وتانەش بەندێکی باش کە بۆ وەزعیەتی ئێستای نیشتمانەکەمان بەکار بێت پیێشان داوە.

لەگەل ئەمەشدا کەئەم نوسراوە لەکەم و کورتی خاڵی نیە، بەڵکو پڕی هەڵەیە هیوام بەبرا هاوخوێنەکانم هەیە بەچاوی لێ بوردن تەماشای بفرمون.

٢-ئەم کتێبەم پێشکەشی لاوان و هاوزبانەکانم ئەکەم بەهەموو ناتەواوییەکیەوە, هیوام وایە یارمەتی بڵاوبونەوەی بدەن، تاکو پشت ئەستور بم جلدی دووەمیش لەچاپ بدەم، لە فرصتێکی ترا، ئیتر هەربژی ئاوانەی هەوا.

**وێنەی ئادەمیزاد**

فیترەتی بەشەریەت بە زیهنی هەمووعالەمی گەیشتوە کە لەتبایع ئاوو هەواو سەردو گەرمی دایەو حواسی ئادەمیزاد تشخیص کراوە بەصفاتی دەستلێدان و بیستن‌و چاولێکردن و چێشتن‌و بۆنکردن و هەر بە تەبیعەتی خاك جنسی بەشەری بە سورو ڕەش‌و سپی‌و ئەسمەرو خەناوی‌و ڕودێز جیا کراوەتەوەو لەصفاتی ئادەمیزادا ئەخلاقی ڕنگاورەنگ و خوشی‌و ترشی‌و گرژو نەرمی و بەدخوی‌و خیرەسەری‌و دەنگخوش‌و دەنگ زەریو زەعیف‌و بەقوەت و سەلیم و سەرکەش‌و حەلیم و بە بوغز و عالم وجاهل و پاك و پیس سالم و دەردمەندو کورت و درێژ دەم دەمی‌و مقیم؛ ڕاستگۆو درۆزن و ڕەحیم و دلڕەق عادل و زالم سەخی‌و ڕەزیل, ناسك‌و قایم هۆشیارو غافلْ بەاشكال نشان دراوە، لە عاسمانی مرادیشا هەرکەسە بۆ حوریەتێکی تەبیعی‌و مادی مەئزون کراوەوە فەقیرو دەوڵەمەند, پاشاو گەدا ئازاو ترسنوك کوێرو چاودار.

جاوا دەرئەکەوێ کەئەم هەمو ڕەنگ و ئەشکالانە بۆ چاوکردنەوەی شارەزایەکانی تەبەقەی بەشەری منهاجیکی لێکدانەوەیەو گۆڕانی ئەم شتانە قسمەن لەتاقەت جەباری دەماغی ئادەمیزاد بەمشکل نەماوەتەوە هەروەکو مزرەی ئەخلاقی بەشەر کەتێکەل تەبایعاتیشە بەڵام گورانی ئاسانە، چونکە ڕکاتێکی گورە ڕیونا ڕاوەستاوە تەنیا لەئیختیاریەتی نفس دایە پەروەردەی گوشت‌ودەمارو خوێن و ئەعزا نیەو کوبوریو ڕشی و کورت و درێژی، ئەمانە لە ئیختیاریەتی نفس دورماونەوە.

چونکی خوێن‌و ئەعزا تێکەڵ شکلە، جاهۆشی ئادەمیزاد ئەوەیە کە ئینسان تەقەلای دورخستنەوەی نقصانیەکانی هەیکەلی خۆی بدات، مادامیکی بە ێ ئارەزووی نەفس ئیمکانەو شکلێکی تەلیسمی‌و جود لەعەیبێکی و کورو ترشی‌و خالنی‌و دەردی لەهجەو زمان و نیفاق و حەسودی و سەرکەشی و بەدخوی و غافلْ و خوێنڕێژی دوربخاتەوە، پاکی نەفس ئەسیری ڕەنگی مختلف کردن گوناهێکی گەورەیە (!) پێویستە لەسەر هەموو فەردێك بو تەریقی وزینت و جودی شر، خۆی هەولْ بدا، مادام ئینسان بەزانین و سەعی لەدوچاری میکرۆبی عەیبداری ڕزگاربونی گونجاوە هەمو قانونیکی زمان ونەدیانیکی ئاسمانی بۆ عەینی یاریدە موساعدە، چونکە ئەگەر خالقی بەشەر معانتیکی بەشەری ئەهینایە وجودەوە، لە تلایشقەی زیهنی دەماغ و جەباریی نەفس و پاکی ئەخلاق و کردنی‌و چونی و دانان‌و هیئت و حسیات منع ئەکرا.

جا کوا بۆ بیرکردنەوەی گۆڕانی ئەم شتانە بە ئاینپەرستی و قەواعدی دنیاداری ڕێکی نەهێناوەو سعی بۆ بەرزبونەوەی ئاڵای مەدنیت لەسەر گشت فەردیك واجبەوە بەیداخی بەرزی ئادەمیزاد

ئیجتماع غایەو مساواتی حقوق‌و کۆشش و علم یاریدەی هم جنس و وجدان و دیانت و زینت و نیشتمان ئەخلاق‌و صفات وزراعت‌و بیولوجی و تأریخ‌و جغرافیاو یاریدەی خزمتە، جا ئێمە ئەگەر بمانەوێ لەوێنەی ئینسان پێش بکەوین ئەبێ سەراپا لە ئیجادی ئەسبابی موتلەق و ئامۆژگاری پەیویستەی ئەم چەند شتەی سەرەوە بەلەدیین و بۆ هەر یەکە کەگەنجێکە وەکو کۆشش خەرج بکەین و حرکاتی غافڵانەی باوباپیرمان جارجار دوربخەینەوە، گا گا جنسی تأریخ بخەینە ناوەوەو یەزدانی پاك کە ئێمە بەڕەنگی جوانی و بەویشکی بخاریوە دەستوپێ‌و ڕەنگ‌و جنسی لە باقی حەیوانات جیا کردوینەوە، محظا بۆ زانین یەکیەتی و جنس پەروەردەکردنە کە ێ ئارەزووی هەر غەفڵەت‌و نوستن‌و نەشونمایەك بوایا عزاییێکی وەك شەرایتی ئەدیانی سماوی بەسەریا تەتبیق نەئەکردین وئێمەش هەروەکو حەیوان لە خۆشی‌و کامەرانی بێ بەش ئەبوین و ئەم هەموو دەلیلانە ئیسپاتی شەرەفیەتی ئادەمیزادە کە ئینسان مەئزونە بۆ بەکارهینانی دەماغ و ئازادی هاوجنس، هەروەکو لەلای خواو، ئادەمیزاد لەهۆشیاری ئینزار نەکراوە لەلایەن قانونی دونیاشەوە عەینی موساعدە هەیە.

حەزرەتی ئادەم کەباپیرە گەورەمانە وەختێك کە لەپەردەی لەلایەن خواوە تەربیەی خواردنی نوستن‌و پاشەرۆژ لەبەرچاوی وئیش‌و گەرانی کراو بە ئیش چاکەو خراپ ئینزار کراو بەرەبەرە ئەوەی کە بەشەریت محتاجەیەتی بەیاریدەی مەلائیکەو قوتی هۆشیاری خۆی بۆی داندرا هەتا گەیشتە ڕادەیەك بۆ پێکهێنانی حەلاڵ‌و حەرام و پەروەردەی منداڵەکانی وزەمین‌و فەلاحەتیان قانونێکی ئەمرو لادانی عاسمانیان بۆ نێردراو بەرەبەرە تەبەقەی ئادەمیزاد بەیاریدەی تەلسمێکی علم وسحری تەبیعەت‌و ڕاکێشەری نفس فراخی شکلی ڕەنگاوڕەنگی ژینیان کرد.

ئادەمی باپیرمان کە جبرائیل تەربیەی نان خواردنی کرد بەهەڵمی نانەکە دەمی سوتاو هەر نژادی ئەو بون کە حوریەت‌و تهزیب بەشەریان گەیاندە ڕادەیەك بەیاریدەی جوڵانەوەی هێزداری عەینی هەڵم تەلفون و لاسلکی‌و تەیارەو سەیارەو میکرۆسکوب‌و ڕومیتەرو تەرمۆمیتەرو غازات‌و کەهربا‌و شوعاعیاتی لێ هێنایە وجودەوە، هەر لەقوەتی تەئمیناتی عەینی بوخارە کەهۆشیاری تەبەقەی ئادەمیزادی خستۆتە ئومێدەواری سەد ئەوەندە مەدەنیەتەوە.

هەموومان ئەیزانین کەپەیدابونی ئەم هەمو ئەساساتانە لەسەرگوشتەی جەوهەرێکی عەقڵەوەیەو تریشقەی ئەقڵیش لەپرشنگی علمەوەیەو بەرزی دانانیش لەیەکیەتی هاورێ‌وتەبەقەوەیە، گونجایشی ئەم نوختەیەمان میلەتی بە کۆمەڵ‌و هۆزو تیرەی ناڕیکە، هەتا گیاندارەکانی ئادەمیزاد لەژێر داوی نادانی‌و بەربەرکانیدا یەخسیر بون هەر ڕۆژە سەرکردەیی بە چنگ یەکێکەوە بو، لەبەر زەبری نەزانین هەموو پۆلیك سەرگەردان مابونەوە، کاتیك دوایینی کومەڵ کەوتە ناوەوە هەر کەسە لە ئاسمانی مرادا هەسێرەی هوش و ئازادیی گەشایەوە.

بەیداغی سەر بەخۆییان لەسەر بەشو میراتی باپیرەیان داچەقاند، حقوقی پاکانەی خویان پاراست، پێویستی ێ ئارەزووی گەلەکەیان بەپیاوانە ڕاگیرکرد، پۆل پۆل بون بەخاوەنی مەدەنیەت و ئاسار، لەژێر سێبەری ئاڵای خۆیەتیدا بە ئازادی مانەوە. هەر کەسە خووی ژیانیکی دیموکراتی، ئەریستوکراتی، نازی، جمهوری. بولشویکی، زۆرداری، مەلەکی، فاشیستی، دەستوری گرت!

لەمەوپێش وتمان کە لەموعجزەی ئادەمیزادا هەموو کارێکی هەر دو دنیا کردن ئاسانە، تروسکەی ئەقڵ شالاۆ دەهاویتە سەر هەموو سحرێکی هێزدار، تریشقەی بیرو هۆش یاریدەدەری هەمو گەوهەرێکی تەبیعییە. بەشەرتێك کە لەلایەن تیرەو گەلەکەی خۆیەوە سەرشێواو نەکریت. هەروەکو -لیولستوی- کەفیلۆزوفیسکی ڕوسبوە، فەرمویەتی ئادەمیزاد لەکردەی گشتیدایە، هێزداری





جولانەوەکەی ئەم دەریازەلامە کوت ئەکاو پێی ئەگاتە جێگای هەویا، هەر لەم وێنەیە کە هوشداریی ئینگلیز-تۆماس کارلایل- وتویەتی: پیاو لەتەبیعەتی بروسکەدایە ئەتوانی هەموو شتێکی هێزدار بسوتێنی و یانەیگاتێ بەڵام ئەبێ بخاری تیرە تین بسێنێ ئەمجا بەرقی لێ پەیدا ئەبێ وەکو پرشنگی ڕۆژ لە وردیلەبینێکدا کە کۆکرایەوە ئەتوانی زۆر شتی پێ بسوتێنی بەڵام کەهەورێك وەکو ناکۆکی ملی هاتە بەریەوە ناتوانی تنۆکە ئاوێکی پێ گەرم دابێنی!

هەمووومان دیومانە بەداری بچکۆلانە ئاگر ئەکرێتەوە، ئەمجا داری گەورەی پێ ئەسوتینرێ، هەر منالێکی شیرە خورەیە، گیانی هوزێك گوشا ئەکاتەوەو هەرتنۆکی ئاوە ئەبێ بە دەریا. هەر ماسی بچکۆلانەیە ئەبێ بەنەهەنگ.

هەرکەسێ سەرنجێکی تەواو لەجولانەوەی ئەقلٚ بگرێت تێدەگا کە هەمو شتێك لە مەیدانی کۆششدا زۆر ئاسانە، یانە هەر وێنەیە شتێکی بەسەرەوە زاڵکراوە، ئاگر پولا ئەچەمێنی و پۆلا لەسەر هەندی گەوهەری ئاسن هێزدارە.

ئاو لە ئاگر زاڵترە، جارجار ئاگر هێزی لە ئاو سەندوە، هەر خاکە کە دەکرێت بە ئاسن و چیا هێزدارەکانی پێ ئەسمێنری و هەر ئەم خۆڵە نەرمەیە کەپۆل پۆل گەوهەری لێدەگیرێ.

جا ێ ئارەزوومان ئەوەیە کەهەر شتێکی بێ هێز کە بەکەرەستەی هاوڕێ پەروەردە کرا زاڵە بەسەر هێزدارێکی بێ پەروەردەدا.

ئەگەر لەماڵێکدا (١٠) کەسی بەخێوکراوی زانین و هاوخوی تێدابێ کوا چوون یەکە لەگەڵ خێزانێکی (١٠٠) ژینی کە هەریەکە بیەوێ سەربەخۆیی خۆی بنوێنێ.

جا وا دەرئەکەوێ کە سەربەرزی ئادەمیزاد عامە، هەر پیاوێ کە بوو تێکەڵی کۆمەڵی دانایی تەنگاوی خوی خۆی کرد ئینجا لەگەڵ هەموو گەوهەرێکی ێ ئارەزوو ئەجۆشێت، هەر هێزو گیانی کۆمەڵیە کەپیاو دەخاتە سەرفرازی و بەختیارییەوە, هەموومان خوێندومانە کە ئەوروپا لەپێش قەرنی (١٨) هەمدا لەژیانێکی نەزانی و پێکەوە نەلکاندا سەرگەردان مابونەوە! هەمویان پۆل پۆل لێکدابڕاو بوون، هیچ کەسێکیان نوسراوی هیچ کەسێکی تریانی نەدەخوێندەوە. لەسەر ئەم هەمو دەردەداریەشەوە خەرج و باجی ئاغاوات و بەگزادە تیرەکەی هەراسان کرد بو، پیتاك و سەرانەی کلێساشی لەهەموو دەردەدارێك ناخۆشتر بو، لە (٥) هزار کەس خوێندەوارێکیان نەبوو ئەوەی هەشبوو لەژێر دیلیی قانونی پاپادا مابوەوەو بەژیانێکی

سەرگەشتەو دەرەبگێتی ڕاپانەبوارد لەگیان ئەفزای ئازادی شێرەرابونەوە، تاق تاق خوێندەوارەکانیشیان لەجولانەوەی کردەی ژیانداری قەدەغە کرابون.

لەساڵی ١٧٥٧دا لەسەر ێ ئارەزووی پاپا بو کوشتنی تێگەیشتوەکانی فرانسە گاڵ درا (!!) تێگەیشتوەکانی پەلامار دران و لەترسان خۆیان شاردەوە هەتا قەرنی ١٨ هەم فرانسە لەژێر چنگی نادانیدا ئەتلایەوە.

ڕۆما هەتا کردەی یەکیەتییان لەناوا باو بو دەسڕۆیی یان لەدەریایی ناوەڕەستدا بو، دو ئیمپراتۆر لەڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا هەبوو، ڕۆژێ کە ژەهری ناکۆکی ڕژایە ناویانەوە بون بەتێکشکاوترینی هەموو سەرزمینێك.

ئەمریکا هەتا لەژێر کەمەندی نادانیدا ئەژیا، هەر هۆزەی کە ڕاست ئەبوەوە ئەیخستە ژێر تێهەڵدانەوە، لەبەر پێی بێگانەدا یەك کەوتوبون، ڕۆژێ کە بیری یەکێتی و خۆمانەیان کردەوە بون بەزاناترینی هەموو گیاندارێکی ئەوروپا، فرانسە هەتا لە ژێر قانونی دەرەبەگێتی و کڵێسادا ملکەچ بون سەرگەشتەترینی ناو هەموو تیرەیەك بون! کاتێ سەربەخۆییان لەپاپاو بەربەری هۆزەکانیان هەڵوەشاندەوە بون بەتیرەیەکی نازداری ئەم ڕۆژە.

جێرمەن هەتا بە گیانی پاکی و تەنها دەژیان لەگشت سەرزەمینا ئالای حوکمرانیان ئەلاژایەوە. کاتی کەپرشنگی ناکوکی و پۆل پۆلی باوی سەند هەرمیلەتە بێ هێزەکانی ژێر چنگی خۆیان لێیان ڕاپەرین و تێکیان دان.

تورکیا: هەتا یاسای کۆمەڵی و دڵ پێسوتانی هۆزیان لەناوا باو بو لە ئاسیاو ئەفریقاو ئەوروپادا دەستڕۆشتو بون! ڕۆژێ کە بێباکی پاشایی و دوبەرەکی تیرە هاتەناوەوە بون بەلێقوماوترینی هەموو ژێردەستێ.

ڕوسیا: هەتا بە ێ ئارەزووی قەوم و خاك پەروەردەکردنی ژیا پاشای بەحرو بەریان یەك پیاو بو هەسێرەی نیازیان لە ئەوروپا خەریکی هەلاتن بو، کاتێ ژیانی سورو سپی و سوارو پیادەی تیادا هاتەپێشەوە بون بەشڵەژاوترینی هەمو دنیا.

هەر هۆزە داپلۆساوەکانی خۆیان بون بە چەند کوت پەلاماریاندان جا ئەمە کردوەیەکی ئاشکرایە هەر نازداری دانایی پێکەوە گونجانە کە ژیان دەخاتە خۆشیەوە، هەر نادانی و ڕقەبەری و ناکۆکیە کە هاوولات سەرگردان ئەکا کۆمەڵی یاریدەدەری هەوێنی ئەقڵە ناکۆکی جلوکێشی بارەگەی نادانیەو وریایی ئادمی کۆمەڵ ئەخاتە بەرگی نازداری، پڕپوچی ئادەمیزاد خاکسەرگەشتە ئەکات.

ئادەمیزاد موعجیزەیەکە هەتا ئێستا جادوەکانی سەرزمین وێنەیەکی وایان نەهێناوەتە جولانەوەوە شورشی هەرە گەورەی فرانسە لەپێش دەوری ناپلیون دا باوەڕ پێ کردنی سەرسامیە بۆ ئادەمیزاد کە تنها پیاویك ئاگاداری ئەم هەموو وڵاتە زۆرەی خۆی کرد، پێی نەشڵەژانی بو گۆڕانی ژیانی قەومەکەی چەقاندو ئالای دوژمنانی لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا سەروبن کرد، نازداری خاکەکەی بەگیان و کردە پاراست، کردەوەو سەرکەشی ئەم نەوجوانە پێشرەوی لەجادوەکانی ئاسراو سەند، پەلاماردانی ڕۆماو شاڵاوی ڕوسیاو ئەلمانیاو شەرق و بەلقانیەکانی باوەڕ پێ کردنی موعجیزەی هێزداری ئادەمیزاد بو.

دەسبازی ئەوروپاو ئەفریقاو زینت شکاندن ئالای (ئالی هو هنزلە ڕن) قەیسەر فرەدریك و ئیمپراتۆریەتی نیشانەی هێزداری مێشکی ئادەمیزادە و هەڵکردنی بەیداغی چاو تونگی ئیسپاتی چاوکردنەوەی هەموو تێگەیشتوویکە، جا هەر ئەم ڕەنگە کردەوانەیە کە بۆتە شاهیدی ئیش لەدەسهاتنی ئادەمیزاد، و هەر هۆشیاری کردەوەی ڕابواردویە کە گیاندارێکی خاوەن لێکدانەوە دەکا بەگژ تولەسانەوەی هەرە پێشویان ئەڵماسی شمشێری برندەی-بسمارك- و پرشنگی هێزداری دانانی (مولتکە) دیسان شاهدی یەك بەهەزاری ئادەمیزادە.

کاتێ کە لەبەر ئەم بەری برینداری ئەڵمان و پروسیادا سەرکردەی تولە ساندنەوە کەوتە چنگ-بسمارك-و (مولتکە) بەهێزداری دانایی و سەرخەرویی ئازادی ڕوی وڵاتەکەیان بەزەردی نەهێشتەوە.

ئالای دەستەوەکەری لەفرانسەداو چونی (هانی بال) بۆ ڕۆما و داڕێژەری پیتاکیان لەسەرزەمین دا شاهدی شت لەبیر نەچونی ئادەمیزادە.

دیسان کردەوەی (کرمول) سەرداری هەرە بەناوبانگی ئینگلتەراو کۆشش پاکی نازدار ترینی هەمو خویەکە.

لەلای گیاندارانی وردەناس ئادەمیزاد و ڕەنگڕێژەکانی خواناسی زانراوە کە پیاو بۆ هەر شتێك کوێرەوەری دی زمانیش بۆ عەینی ئارەزوو تەسلیمە.

چونکە زمان بۆ پیاوی ئیشکەر وەکو چەکێکە لەنیشانەی ئارەزوو هەموو کاتێ تەقاندنی ئاسانە.....

پەراوێز:

ئەم نووسینە بەشێکی کەمی نامیلکەی (هەنگاوێك بەرەو سەرکەوتن)ە کە نووسەر بەناوی م.م. پژدەرییەوە بڵاوی کردۆتەوە.

سەرچاوە:

هەنگاوێك بۆ سەرکەوتن، دانەری م. م. پژدەری، چاپخانەی بەلەدییە_ سلێمانی، چاپی یەکەم ١٩٣٨ی زایینی.

# دادگایی کردنی نوسەر لەسەرکتێبی هەنگاوێ بەرەو سەرکەوتن

تصویری ئەو مەحکەمەیەم کە لە ١٧/تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٨ لەسلێمانی لەسەر دانانی کتێبی (هەنگاوێك بۆ سەرکەوتن) کرام کە ئەیانهێشت محامی ئیبراهیم ئەحمەد دیفاعم لی بکات و بەدزی ئەوەوە مەحکەمەیان ئەکردم.

حاکم-عبدالعزیز خلوصی

متصرف-مجید یعقوبی

مدیر شرطە-سید علی حجازی

لە نتیجەدا محکوم کرام بە ٦ مانگ بەندی شدیدو ساڵێك موراقەبەی پۆلیسو دەست بەسەرا گرتنی ١٥٠٠ نسخە لەکتێبەکەمو دەرکرانم لە وظیفە.

**( پرسیاری دادستێن )**

پۆلیس بیهێنن – بەڵی ئەوا هات

بیخەنە قەفەس – وەستاوە لەلات

تۆ ناوت چیە – میرزای مەنگوڕی

فەرمانت چیە – لاتیو بێ گوڕی

عومرت چەند ساڵە – میرم بیستوهەشت

لەسەر کام دینی – پەپولەی بەهەشت

ئەڵێن شیوعی – شیوعی چیە؟

مساواتی گەل – ئاگام لێ نیە

چۆنە دە بیڵێ – چی بڵێم کە نەبێ؟

ئەڵێن تۆ ئەوی – حاکم چۆن ئەبێ؟

لێیان بیستووی – درۆیان کردوە

شاهدمان هەیە – پەی پێنەبردوە

**( وەڵام دانەوەی مەنگوڕی )**

ڕەنگ بی ووتبم ڕەووشت دو تەرزە

یەکیان زۆر پەستە یەکیان زۆر بەرزە

ئەوەی کە بەرزە پێی ئەڵێن جمهور

یانە پاشایی بەمانای دەستور

دیمکراتی راست وەکو یەکی تام!

سەربەستی پێنوس ئازادی کەلام

فەرق نەکردنی کورد لەگەڵ عەرەب

بۆ ڕۆژی غەمو بۆ ساتی تەرەب

هەژارو زۆردار لەئەم جیهانە

وەکو یەك پێویست بەرزی ژیانە

حکومەت گەلەو گەلیش دەوڵەتە

هەر دو مەسئولن پیاو چاكو چەتە

کە دەوڵەت هەیبو نیظامو انصاف

هیچ کەس دەرناچێ لە ڕەوتی ئەشراف

کە هاتو نیظام فەرقی شەخسی کرد

مانای ئەوەیە پێشکەوتنی مرد

کە هاتو کۆمەڵ بێ ئیشی نەما

ئەستێرەی بەختی بەرزە لە شەما

کە ژیان ڕێکوپێك بکرێ لەناو هۆز

هەمو کەس چون یەك ئەژی بەدڵسۆز

ئەمە ڕوداوی ژیانی بەرزە

ئەتۆش تأیدم ئەکەی بەم تەرزە

ژیانی پەستیش دەورێکە تاریك

ئومێدو ئامال داوێکە باریك

وەکو ئەمرۆکە لەسەر لەتێ نان

یەکتر ئەخەینە ناوبەندو زندان

یەکتر ئەکوژین بۆ هەندی مەعاش

کرنوشیش ئەبەین بۆ شورباوی ماش

دزو درۆزنی بوە بە پیشە

سەد بەشی هۆزمان بێ کارو ئیشە

لە دەورەی پەستا پۆلیسو مەئمور

هەر بە ڕاوو ڕوت گەل ئەکەن مەغدور

دەستی حقائق لەناو وون ئەکەن

بەدکار بەرئەدەن پیاو چاك بەند ئەکەن

پرسیارو بازرەس هەرگیز نامێنی

هەر کەس ئازابێ با خۆی بژێنی

کۆنەپەرستی نیظامی پەرپوت

ئەیەوی دایم هۆزێ بێ نابوت

حوکمی ئیستبداد هێزی دکتاتۆر

ئەیەوی کۆمەڵ بمری بەسەر شۆڕ

نەوەکو چاوی زانیارو هونەر

دەستەی زۆرداری بکات دەربەدەر

ئەیانەوی گەل دایم ژێربار بێ

نەوەکو ڕوژی گەلیان لێ هاربێ

کا ئەدەن بەشێر ئیسقان بە گاجوت

ئاوا شەرەفی گەل ئەکەن نابوت

ڕەنگ بێ وام گوت بێ کەوا گیراوم

لەسەر ڕاستبێژی پێوەند کراوم!

جا ئەی حاکم گیان کام لا باشترە

لەم دو ژیانە کامیان چاترە

تۆ کام لات هەڵگرت منیش لەگەڵ تۆم

بە قسەی نەزانان مەدە لەئەستۆم



تۆ کام لات ئەوی کام لات پی باشە
منیش هەر هەمان مزەم لەم ئاشە

**( پرسیاری حاکم )**

پۆلیس وا نالیٚ – پۆلیس ناناسم
ئەی لەکیٚ پرسم – خۆم خۆم ئەناسم
ڕاپۆرتیان داوی – کەیفی خۆیانە
ئەڵین شیوعی – پیێم وتوی گیانە
لەمە واز بێنە – ئەی چی بکەم میرم؟
داوای کەت هەیە – ناهێتە بیرم
کتێبی هەنگاو – بەڵیٚ بەڵیٚ دەی
ئەمەت زۆر بەدە – نەکەی وای تێبگەی
باشی تێگەیووم – نا عەفوت فەرمو
ڕوشکێنم ئەکەی – نا بەسەری تو
ئەو کتێبەی تۆ پڕ لە تەحریك
لە ووتەی مێژویی ڕوناك و تاریك
ئەوەڵ جار باسی هیتلەرت کردوە
پەنجەت بۆ چاکی نازیەتی بردوە
ووتوتە کوردو ئەڵمانی ئارین
ئەتەوی کە کورد لەگەڵ ئەو بژین
دوهەم زۆر باسی جولەکەت کردوە
کە چۆن شاڵاویان بۆ عەرەب بردوە
مەبەستت وایە خەڵکی کوردستان
بەهەمان دەستور بینە ناو مەیدان
سێهەم پروسیات کردوە بە میسال
باسی (فنلەندە)ت کردوە بەهەرحاڵ
قەسدت لەمەشا ئەوەیە کە کورد
لە زدی عەرەب وا بکەن دەستو برد
(چوارەم) لە ڕەوتی دینت لاداوە
شێخ و دەروێشت بەهیچ داناوە
لەمەشا بیرت هەر کورد هاندانە
لەدین دڵ سارد بن بۆ ئەم مەیدانە
(پێنجەم) ووتوتە ئینگلیس فیڵبازە
ئەوەی بەهیوای ئەو بیٚ ناسازە
لەمەش هەر دیسان مەبەستت کوردە
چونکە ئەم باسە سیاسی و وردە
گوایە سەبەبی گەورە ئینگلیسە
کەوا ئیشی کورد ڕیس و گوریسە
زور شتی ترت گوتوە بەم پێیە
جاری پێت ناڵێم لەم وەخت و جێیە
وەڵامت چیە بیڵی مەوەستە؟
پاشەڕۆژی تۆ تاریك و پەستە

(وەڵامی مەنگوری)

حاکم تۆ قسەی خۆت لەبیرچوە
پیاوێك چۆن (نازی)و شیوعی بوە
چونکە مەبدەئی شیوعی و نازی
پێکەوە ناژین قەت بەدڵخوازی
وەك ئاگرو باروت زدن بەیەکتر
کەلێك نزیك بون هەڵ ئەستێنن گڕ
لەپرسیارتاندا ئیختیلاف هەیە
ساغی بکەرەوە ئەسلم کامەیە
من عەرزم کردی راپوری ناشی
ناوی بەد کردوم بۆ فکر باشی
من ئەسڵەن کوردم کوردی کەژو کێو
ئەمەوێ خاك و هۆزم هەبێ نێو
نەوەك ناوێکی ناکۆك و شێواو
بەڵکو ئەمەوی هەر دەرچێ لەداو
وەك عەرزم کردی ئازادی دەستور
کوردیش بەخێوکا بەبەرزی شعور
بەشعوری گەل چرای بەختیاری
عێراق ئەخاتە خۆشی و رزگاری
جەنابی حاکم عەبدولعەزیز بەگ
خودا بۆ ویژدان داینا خوێن و ڕەگ
لەباسی هۆزی جولەکەو کاریان
شتێکە ئینکار ناکرێ ڕەفتاریان
ئەم هۆزە یەك جار ژێرو پێشکەوتون
وەکو ڕەگی دار بەژێر ئەرزا چون
بەفەنو علم و اقتصادیات
ئەوەڵ گەلێکن لەبەرزی خەبات
کردەوەی ئەمان لە ناوچەی جیهان
بۆتە تەئریخی کۆشش و هەستان
نابێ بەتاوان باسی هۆزی ژێر
قانون نایگری (وما في الضمير)
قانون سەریحە سەراحەت بێژە
بەهانە گرتن ڕەووشتی گێژە
لەم باسە تەنها یەکیەتیم ئەوێ
عەرەب باپیاو بێ پێش ئەمان کەوێ
دیسان ئەمەشتان هەر ئیختلافە
کەمن (نازی)بم ئەمەت ئیسرافە
دوژمنی یەکن جولەکەو نازی
خوێنی یەك ئەخۆن بۆ سەرفرازی
شیوعی و نازی، جولەکەخواهی
بەکەسی ناکرێ ئەی حاکمی داهی
ساغی بکەرەوە بزانە کامیانم
بەم پێیە بنوسە نامەی تاوانم
سێهەم تەئریخ (پروسیات) فەرمو
مێژو باسکردن دەرمانە بۆ خو
تاوان هەر هێندە جرمە تا ئەکرێ
میراتی ئەسرار بەمێژو ئەدرێ
(بزەی) رابوردو ئەبێ بە تەئریخ
خەبات و زانست بەم دائەکوتێ بنج
مێژو شتێکە هەر کەس بەباری
ئەیخوێنێتەوە بۆ ئیش و کاری
مێژو شتێك نیە تەنیا بۆ کوشتن
بۆ ئاژاوەی گەل بۆ یەکتر خستن
بەڵکو شتێکە وەکو تیشکی خۆر
میکروب ئەکوژێ مکروب ئەکا زۆر
بۆ کوردو عەرەب ئەوە نوسراوە
با عارەب زوتر فێربێ کە پیاوە
خەبات بۆ عارەب بۆچی جائز بێ
کورد بو لەهەولا بێبەش و ریز بێ
هەردو عراقین هەردو برای دین
بەیەك ڕەووشت و بەیەك بیر ئەژین
تۆ ئەم ناکۆکیە بۆ ئەخیتە ناو
کەئەمان بران لەیەك خاك و ئاو
لیژنەی تەشریعی لیژنەی تەنفیذی
وای بریار داوە بۆ یەك خوو ریزی
ئیتر تۆ چیتدا لەپەنجەی تەفریق
کە من نەموتبێ شتێ بێ تحقیق
چوارەم دیانەت شتێکە زۆر جوان
بەڵام بەقەدەر تەواناو ئیمکان
نەوەك بەتوندو هێزی ئیجباری
بەپێی هەڵکەوت و ڕۆژو ئەدواری
دیانەت ئەبێ لەگەل تەمدون
بروا بە ڕێدا نەروا ئەبێ ون
دیانەت شتیکە ئەسڵەن ویراسی
میراتی باوکە هەر چۆن بێ باسی
وارث ئازادە بۆ زیادکردنی
بۆ پتەوکردن و لەناوبردنی
مرۆڤ مەحکومی دیانەت نیە
چونکە زۆرداری لەلای خوا نیە
خودا بەرامبەر تەواناو کاری
نایەوی ڕۆژو و نوێژی ئیجباری
مرۆڤ ڕەوشت و ئەخلاقی چۆن بێ
هەر بەم هەوایە ئەژی چەند کۆن بێ
ئەگەر دیانەت ئیجباری بوایە
هەزار دیانەت نەئەبو بوایە
مانای ئەوەیە خودا ئیختیاری
داوەتە دەست خۆت بۆ هەڵبژاری
ئەتۆش ئازادی بەپێی ئارەزو
بۆ کام لا ئەچی بڕۆ سەربەخۆ
ئەوەندەی هەیە پێویستی شعار
شتێکە زەروری لەهەمو ئەدوار
هەرچەند لادین بی ئەبێ شعارت
هەبێ بێ شعار ناڕوا کردارت
جا کام شعارت ئەوی ئازادی
نابێ لەگەڵتا بکرێ عینادی
بەلام وجداناً شعاری ئیرثي
لەوە باشترە تازە لێی پرسی
بەڵام کە گوترا دەوری سەربەستی
نابێ ئەم شتانە بخەیتە سەردەستی
دین و سیاسەت پێکەوە ناژین

وەك (بەرازیل)و شیلی) ئەرژەنتین
جیهان ئیعتبار بکەی بەس بۆ ژین
کە دیانەتت گرت (وەك تبت و کالی)
ئەبی رو بکیتە باری جهالی
جا من شەخسیەن بیری خۆم وایە
کە دین لەباوەش سەربەستی دایە
بەبێ سەربەستی خۆشی و دڵ سازی
ناهێتە وجود ئەسڵی دین بازی
کردەوەی چاکە ریشەی دیانەتە
لەزانست ئەزێ ئەم خوو حاڵەتە
کە کردەت باش بو دروشمی دینت
پارێزراوە بەپێی ئاینت
ئەمن ئازادی پێش دیانەت ئەخەم
ئازادی ماڨ گشتە وەك تێبگەم
دیانەت شخصیە ماڨ گشت نیە
چون خوا لەسەر دین یەك کەوتو نیە
کە تەئید بکرێ بیری سەربەستی
نابی گوێ بگرێ لەکردەی پەستی
بەکەڵکی چی دێ شێخ و دێوانە
فەلسەفەو منطق چیە لەم ژیانە
خودا کە هەبێ ڕەهبەری ناوێ
ڕەهبەر خۆی دیلە لەناو گەرداوێ

مباشرەتەنَ مرۆڤ لەگەڵ خوا
عیلاقەدارە بی چاوساغیو ڕا
زۆر عەیبە بۆ خوا کە شەخصی ثاني
بکا بە دەلیل بۆ خود نیشانی
ئیمانم هەیە بەدین بەسیَ ڕیَ
فلسفەو منطق طبي بەڕێو جیَ
هەرچی ئەم سیَ شتە نەیگری بەتەواو
لام خوڕافاتە پێشی بچمە داو

**( پرسیاری حاکم )**

بەس لەسەری بڕۆ – بەڵی وا وەستام
لەکوێت خوێندوە – لە پژدەر دادگام
لەکام مدرسە – مەدرەسەی نەبو
ئەی چۆن فێربوی – منیش وەکو تۆ
من لەحقوق بوم – من بەولاوە تر
ئەم قسانە هی کێن – هی خۆمن زیاتر
ئەم قسانە بەرزن – من خوشم بەرزم
ئەی بۆچ وا لاتی – چۆن خاوەن تەرزم
کوا وەڵامی پێنج – هەر ئیستا ئەیڵێم
وەخت کەم ماوە – منیش تەزی پێم

**( وەڵامی مەنگوری )**

پێنجەم ئەفەرموی ئینگلیس فێڵبازە
چۆن ئینکار ئەکریَ ئەم ڕیَو نیازە
ئنگلیس لەم ڕۆژە پەنجا ملیۆنە
وەڵاتی ئنگلیس کوورو بی شوێنە
کە فیڵباز نەبیَ چۆن هەزار ملیۆن
عالەم ئەچێتە ژێر هێزی (سەکسیون)
ئنگلیس گەر سیاسیو ئیستعمار نیە
لەناو ئێمەدا مانەوەی چیە
ئێمە کەناومان هۆزی ئیسلامە
کارمان بە ئنگلیس چیە بەم نامە
ئەتۆ لەلاییَ ئەڵێی دیانەت
ئەوەڵ شتێکە بۆ ڕوی صیانەت
کەچی لەعەینی وەختا بۆ کافر
کەوتویە بەندو باوی وەکو گڕ
یا ئەبیَ حکمی قورئان نەسخ کەی
یا ئەبیَ بەپێی شەرع دەریکەی
جا کام لا قەرار ئەدەی هەتا من
بیری خۆم بگۆڕم بەرامبەر دوژمن
کە ئەڵێی سیاسەت مقتضای نیە
لەرێی ئازادان ئەم کۆسپە چیە
پێنوسی ئازاد ئازادی ئەویَ



سیاسەت لە خاكمان ئەبێ دوركەوێ
كە تۆ بۆی ببیە وەكیلی ئەسیل
بێ لایەنیت گریت چون ئەكەی تەمسیل
من بۆ بەرزی گەل ئەكەم ئەم شینە
چون دۆستی ئینگلیس زەرەری ژینە
بەرامبەر بەدین بەرامبەر بەژین
تاوانی هەیە دۆستی غەیرە دین
پێویستە ئێمەش ڕو بكەینە نەهزەت
بۆ یاسای بەرزو بۆ خۆشی میللەت
كە ئێمە خۆمان خاوەنی نەوتین
بۆچی وا ژێرپێی بێگانە كەوتین
بۆچی بۆ خۆمان نەژین سەربەخۆ
ناحەز لەناومان بكا هاتوچۆ
جەنابی حاكم لەم بەیاناتە
تەنیا مەبەستم ڕێگای نەجاتە
حوسنی نیازم بگرە بەرچاوت
لەهەمو باسو پرسیارو داوت
بۆ ئازادی گەل من ئەمەوێ ژین
بژی ئازادیو خۆشی سەر زەمین

**(بڕیاری دادگا**
**لە ڕۆژی ١٧/١١/١٩٣٨ دا)**

پولیس بیهێنن – گەورم حاضرە
كورە گوێت لێبێ – هەموم لەبەرە
تۆ لەم ئیشانە هەموی عضو بوی
چون بەڵگە نەبو كە بەد ڕۆیشتوی
بەڵام بۆ ئەوەی كە جارێكی تر
گۆڤار دانەنێی لەمە خەراپتر
بەپێی قانونی عقابی بەغدا
هەشتاوونو (أ) جا لەم مادەدا
بەناوی سیاسەت ئاژاوەی موزڕ
گوتاوەڕوی بەد نوسراوی بەگڕ
ئەوا حوكمم دای بە شەش مانگ زیندان
ساڵێك ژێر چاوی و گۆڤار سوتان
ئەگەر نارازی بچۆ تەمیز كە
ئیتر لەمەولا ئیشی وا مەكە
(ئوستانداری شار لێتان دڵگیرە
هەر ئەو نەیهێشتم لات دەم لەم بیرە
حاكم خوا حافظ تەمیزیی ئەكەم
خوا یاربی ئەبی من خۆم ڕزگار كەم

تەمیزم كردو تەبریە كرام
بەڵام لە زیندان زۆر سزا درام
بردیانمە كەركوك بۆ كرێكاری
پێیان ئەكێشام قەمچی زورداری
ئەم جەفایەم دی لەپێناوی هۆز
كە بەرەڵا بوم هەندێ لە دڵسوز
پێم پێنەكەنین كەوا ڕوتەڵەم
هێندە بەدبەختو لاتو (چوكەڵەم)
لەجیاتی تەقدیر چاكەو دەست گرتن
دڵ یان ئەشكاندم بەبێ سرەوتن
من خۆم ڕازی بوم بە شەش مانگ زیندان
بەلاتیو دەردو جەفاو ئەزیەتدان
كەچی هاوبیرو هاوئیشەكانم
ڕێگای خەراپیان ئەدا نیشانم
بەڵام چۆن ڕاستو دڵسوزی گەل بوم
نەترەم بەرنەدا چاوەڕیی هەل بوم
كرام بە مەئمور هەتا چلو چوار
بۆ كورد لەم بینە زۆر خۆم دا ئازار
دەنگی دایەوە دیسان هەوڵێ من
لەلای دۆستانو لەكوڕی دوژمن
ئوستاندارەكەی لوای سلێمانی
ساڵێك گرتمی بەبی وجدانی
هەرچەند كە كورد بو بەجیاووك مشهور
بەڵام (مارفێك) بو زۆر چەوتو مەغرور
بەبی مەحكەمە بەبی ئیتغار
بەمەرسومێكی اقطاعي زۆردار
محكومی كردم بە ساڵێك بەندی
بە ساڵێك نەفی دور لە (مەڵكندی)
ساڵە بەندیەكەم تەواوكرد ناچار
لەپێش نەفیەكەم هەڵاتم وەك هار
چومە ناو كوردی ئێرانی ئازیز
لەگەل ئازادی خواهان بەیەك ڕیز
لەگەل (قازیدا) بەیەك دڵو گیان
ملمان دایە ژێر بەرزی كوردستان
بوم بەرەئیسی ستادی لەشكر
پێنوسو زمانم هەردو كران حوڕ
تا پەنجەی سیاسی ئاڵای ئازادی
كوردی لەناودا ئەژیم بەشادی
لەچلو حەوتا بەشینو گابۆڕ
سابلاغ كەوتەوە ژێر پێی دكتاتۆر
لەشكری ئێران كەوتە زەدو خورد
دیسان بو بەشین بەزمو خۆشی كورد
لە سابڵاغ گیرام خرامە زیندان

داركاری ئەكرام بەپەنجەی بەدان
شەوێ لەشەوان وەك شێر دەرپەڕیم
قەفەسم شكان وەكو باز فڕیم
بەرەو (كەلی خان) دام لە شەقەی باڵ
لە (كەندەسورە) مامەوە دو ساڵ
لەو كەل بۆ ئەم كەل لەو دی بۆ ئەم دی
ئارامم نەبو نە ڕێم بو نە جێ
گاهی پشدەری گاهی مەنگوری
گاهی (گرورکی) گاهی كەڵهوڕی
هەر ڕۆژ بە ڕەنگێ ناوی خۆم ئەنا
لە ئێرانو ڕوم نەم مابو پەنا
لەچلو هەشتا دەوڵەتی عراق
بەخشیمی لەپاش هەزاران مەراق
ماڵو خێزانم بران بەئەسیر
برانە (بانە) سەرگەردو فەقیر
عێراق لەم بارە هیمەتی نوان
شكایەتی خۆی گەیاندە تاران
خۆم لەعراقو خێزان لە (بانە)
بزانە ئەم دەردە چەند قورسو گرانە
بەحەوت مانگ ئەمجا منداڵ بون ئازاد
لە عێراق تێكرا بەیەك بوین شاد
ئەمجا هەژاریو باسی بێئیشی
دڵی ئینسانی زۆر پێ ئەهێشی
لێیان لائەدام دۆستو برادەر
لەزدم ئەدوان بەدڵ سەرانسەر
حكومەت دیسان همیەتی نوان
بۆ پێكهێنانی كەرەستەی ژیان
بە مەمرەو مەژی كرامەوە مأمور
بە موچەیەكی كزو كەموكوڕ
یاران ئەمە بو باسی زیندانم
باسی خزمەت و هەوڵ و هەستانم
لەگەڵ ئەم دەردو جەفاو زیندانە
دینو ئیمانم هەر كوردستانە
بۆ خزمەتی گەل هاتومە جیهان
هەر بەنیشتمانم هێناوە ئیمان
لە كورد زیاتر مەبدەئم نیە
لە كورد زیاتر خوشیم بۆ چیە
من خۆم بەخشیوە بەگەلو نیشتمان
با بەخوێنی من بژی كوردستان

حقائق بەسەرهاتی
شێخ محمود
لەپەنای ئیستقلالی کوردا

میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری
١٩٥٢

ژنگرپسی درندە و مەل
لە کێوە رەشی رانیە

دانەر
میرزا محمد امین مەنگوری
١٩/ نەوروز/ ١٩٦٩

گەشتی ئەستێرەی
مەریخ

محمد امین مەنگوری



حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٨)

# بەسەرهاتی سیاسی کورد

لە ١٩١٤ وە هەتا ١٩٥٨

یاداشتەکانی
میرزا محمد أمین مەنگوری

بەشی دووهەم

سلێمانی ٢٠٠١

# بەسەرهاتی سیاسی کورد

لە ١٤/٧/١٩٥٨ تا ١٩٨٥

بەرگی یەکەم - ڕووداوەکانی کوردستان لە ساڵی ١٩٥٨ تا ساڵی ١٩٧٠



# زێرنیای ئامیدی

کچە کوردی قارەمان



پێشەکی چاپی دووهەمی

# گەشتی ئەستێرەی مەریخ

بەقەڵەمی
میرزا عەلی کیتابی

ساڵی ١٩٧٠ ی زایینی بەرامبەر بە ساڵی ١٣٢٩ی هەتاوی، لەهەلومەرجێکی مێژووییدا کەتازە بەیانی ئازار (١١ی مارس) لەنێوان حکومەتی بەعسی بەغداو مەلا مستەفا بارزانیدا ئیمزاکرابوو، لەگشت گرینگتر، بۆ یەکەمین جار ددان بەبوونی نەتەوەی کورددا دانرابوو، لەکوێستانی کوردستان پەرتەوازەی گەرمین بووم.

وەك ماسییەك لەنیوەشەو بەولاوە، لەبەر تیشکی مانگەشەو، بە ڕێواساودا هەڵکردو، لەبەرەبەیاندا سێڵاو ڕامالیو، قوڕاوی و نیوە گیان، بەهەڵکەوت کەوتبێتە ناو کۆمەڵانێکی روون، لەچنگی لیتەولێڵاو ڕزگار بوو بێت، ئەمن ئاوەها هەستم بەخۆم دەکرد.

لەئێوارە کاتێکدا، لەشاری سلێمانی کە بەناو قەیسەری نەقیبدا، بەبەر جامخانەی کتێبخانەیەکدا رادەبوردم، تایتڵی سەربەرگی کتێبێك لەناو (ویترین) واتە شوشەش جامخانەی کتێب فرۆشیەکە سەرنجی ڕاکێشام، کە بەخەتێکی شیکو شیرین نوسرابوو، گەشتی ئەستێرەی مەریخ، نووسینی میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری.

سەرەتا ناوی نوسەری کتێبەکە خستمیە ناو شك و گومانەوە، چونکە باوکم ناوی میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی بوو دەستی نووسینیشی هەبوو!؟

پاش سەرنجدان و هەڵوێستەیەکی چەن دەقیقەیی ویستم بچمە ناوەوە کتێبەکە بکڕم، دیم داخراوە، خاوەنی لەوێ نییە، دیسانەوە بەدیقەت سەرنجم توندکردەوە سەر بەرگی کتێبەکە، ئاخر ناوی نووسەرو ناوەڕۆکی کتێبەکە، هەرتك وەك یەك بۆمن سەرنجراکێش و گرنگ بوون.

من کە لەساڵانی سەرەتای ناردنی مانگە دەسکردەکانی ڕووسی و ئەمریکایی بەدیقەت و تامەزرۆییەوە لەگۆڤاری دانستنیهاو رادوێکانەوە، پەیشوێنی شیکردنەوەی زانسیاری عیلمانی کورەی مانگ و مەریخ، کەوتبووم، ئەو شەوەی ئارمسترانگ و هەڤاڵەکەی، بڕیاربوو بەمانگی دەسکردەوە لەسەعات یەك و نیوی پاش نیوەشەودا لەسەر گۆی مانگ بنیشنەوە، ئەوشەوەی کەبڕیاربوو گرینگترین ڕووداو لەمێژووی بوون و تەمەنی مرۆڤدا ڕوویدا، بۆ یەکەمجار مرۆڤ لەسەر گۆی ئەستێرەیەکی سەماویدا بنیشێتەوە، من تاکاتی نیشتنەوەیان نەخەوتم و نەسرەوتم، چونکە وەك کێڵگەی بێ ئاو تینووی ئەوباس و خواسە عیلمانە بووم.

ئێستا بیری نووسەرو ناوەڕۆکی نادیاری نووسینەکە، وەها کاس و واسی کردبووم، بیان گرووبام بەخۆم نەدەزانی، لەناکاو بەدەنگی سەرایەداری قەیسەریەکەوە ڕاچڵەکام، کە بەتەوس و تەشەرەوە وتی:

-کاکی خۆم بۆچی نابینی گشت دووکانەکان داخراون؟ کاتی داخستنی دەرگاکانی قەیسەریەکەیە؟ بەشەرم و خەیاڵەتەوە هاتمە دەرێ، بە دوودڵی چوومەوە، بەحەسرەت و چاوەڕوانی کڕین و خوێندنەوەی گەشتی ئەستێرەی مەریخەوە سەرم نایەوە، ڕۆژی دوایی چوومە بازاڕ خۆم کرد بە کتێبخانەکەدا.

وەك برسیەکی چاوچنۆك بەهەڵکەوت بەسەر سفرەو خوانێ ڕەنگاورەنگی (خواپێداوێکدا) کەوتبێت، بەهەڵەشەو سەرلێشێواوی، پاروێك لەم و دوان لەوانی تر؟ منیش دەستمدایە کتێبەکە، لەهەر لاپەڕەیەك تاقە دێڕێکم دەخوێندەوەو دەچوومە پێشێ و دیسان دەگەڕامە دواوە، پەراوەم بەدانەدانەی لاپەڕەکانی دەکرد، تومەس مەلایەك لەپشتی سەرمەوە دەمێکە من و کتێبەکەی خستۆتە ژێر سەرنجی خاس و بۆ مەبەستی خاسی خۆی، لەناکاو دەستێکی دا بەسەر شانمدا، پڕ بەخۆم ڕاچڵەکیم، کەئاوڕم دایەوە، مەلایەك بەمێزەری سپی و عابای کوڵ و کەشیدەی زەردی کەمەریەوە، بەڕووی گرژو سیمای مۆن و تەوس و تەشەرەوە، وتی:

-ئەرێ کوڕە خوێندەواریت هەیە؟ منیش خێرا لەبەری هەستام بەوپەڕی حورمەتەوە وتم: بەڵێ مامۆستا گیان، دەیشخوێنمەوەو جاروباریش سکاڵاو کەف و کوڵی دەروونیشم لەدووتوێی پەراوێك یادەفتەرێك تۆماردەکەم.

مەلا هەڵوێستیەکی کرد، وەك کەسێکی خەیاڵاوی تینوو، بەتەنیا چەن تنۆکێك ئاو گەرووی وشکی خووساندبێت، زمانی بەلێوەکانیدا هێنا، بەنیوە حەپەساوییەوە ڕوویکردە لاوی کتێب فرۆش و وتی:

کوڕی باش، ئەگەر میعراج نامەی فەخری عالەمت لایە؟ تکایە نوسخەیەکم بدەرێ، کاکی کتێب فرۆش بەشێنەیی گەڕا میعراج نامەی پێدا کرد وتی:

فەرمو جەنابی حاجی مامۆستا، مەلا لەپەنامەدا دانیشت دەستێکی بەسەرمدا هێناو ئەملاولای ڕومەتی ماچکردم و میعراج نامەکەی پێدام، ئینجا دەستی کردە گیرفانی داو ١٠٠ فلسی بەکتێب فرۆشەکەداو بەمنی وت:

کوڕی خۆم میعراج نامەی فەخری عالەم بخوێنەرەوە، ئەم جەهالەتنامەیە توڕ هەڵدە، دیسانەوە ئەملاولای ماچکردم و خواحافیزی لێکردم و ڕۆیی).

پاش ڕۆیشتنی مەلا، کتێبفرۆش زۆر بەنەرم و نیانی و ویقارەوە وتی:

کاکە گیان وادیارە لەبرادەرانی کوردی ئێرانیت؟ وتم بەڵێ، بانگی کرد دوو چایان بۆ هێنایین یەکێکی نایە بەردەستی من ئاهێکی هەڵکێشاو وتی:

—من حەدم نیە وەك جەنابی مامۆستا ئامۆژگاریت کەم، دەزانم لەمن و ئەو ژیرترو وریاتری، بۆیە ئاوارەی؟ من وەك وەبیرهێنانەوە عەرزت دەکەم.

پاش ڕووداوە مێژینەکەی ١٣٢٠ لەرۆژهەلاتی کوردستان، ڕوونتر بڵێم پاش لەدایك بوونی کۆمەڵەی (ژك)و پاشان کۆماری مەهاباد، ئەمە بۆ دووهەمینجارە کە (چەوتی زەمانە) بۆی ڕاست کردوینەتەوە، سووچێك پچکۆلەو کۆمەڵێکی یەکجار کەم مرۆڤی کورد لەچکێکی چکۆلەی زنجیرە چیای زاگرۆس دا، لەسەر سێ سووچی پێکەوەنووساوی سنووری دەستکردو دابەشکراوی کوردستاندا، هەل و مەرجێکیان بۆ ڕەخساوە، تاق و تەرا زاناو بلیمەتی بەجەلابەزەو جەسووری کورد، کەساڵەها بەشێك لەبەرهەمی ئەندێشەی وردو تیژیان، لەترسی دەستەڵات دارانی کۆنەپەرست و مفتیانی مفتەخۆرو کەللەپووك، لەمێشکی فراوان و سینەی بێکینەیاندا حەپس کردووە، یا لەسەر کاغەز، تۆماریان کردووەو لەکون و کەلێنی تەویلەو کادێن، یان سەنگچن و کەڵەکەبەردو کولورەداری ناو مووچەو مەزراکانیاندا شاردوویانەتەوە، بەو هیوایەی ڕۆژێك لەرۆژان هەلیان بۆ هەڵکەوێ، هەرنەبێ ناڕاستەوخۆ بەشێوەی چیرۆك و ئەفسانە لەچاپی بدەن و کۆرپەی ئاواتیان لەمەرگ ڕزگارکەن، ئێستاکە بۆ یەکەمجارو بەدەگمەن نووسەرێکی زاناو بەغیرەتی ورد، توانیویەتی ئەو خزمەتە گەورەو گرینگە پێشکەشی ڕووناکبیرانی گەل و نیشتمانەکەمان بکات، ئەوەتانێ پێشەواکانمان بەدۆعاو نوشتەو ئایەتی (حبل المتین) دەست و پێ و چاومان دەبەستن و پاشەو پاش دەمان کشێننەوە، کاکی خۆم هەروەك مامۆستا میعراج نامەکەی حەزرەتی محەمەدی عەرەبی وێرکردی!؟ منیش میعراج نامەکەی میرزا محەمەد ئەمینی کوردت، پێشکەش دەکەم، بەڵام بەوهیوایەی هیچ کات لێکیان جوداو دوورنەخەیتەوە، بارۆڵە ڕووناکبیرەکانی کوردو عەرەب، هەردووك محەمەدی عەرەبی و کوردی بەباشی و تێروتەسەلی بناسن).

من لەمنداڵیەوە لەلایەن باوکمەوە بەئیمان و ئیسلام و میعراج نامەو مەولوودنامەی حەزرەتی موحەممەدەوە گۆش و پەروەردە کرابووم، هەڵوێست و موجیاری جیاوازی حاجی مەلاو کاکەی ڕووناکبیری کتێبفرۆش و ماناو ناوەڕۆکی کتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخ، شۆڕەی شۆڕشێکی فیکری لەمێشکمدا خولقاند).

پاش موتالای کتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخ و بەراوردکردنی لەگەڵ مەولوودنامەو میعراج نامەدا، هەستم هانی دام لەڕوانگەیەکی نوێوە بەخۆم و نووسینەکانمدا بچمەوە، کەدوو بەرگم بۆ چاپ ئامادە کردبوون، کتێبێك بەناونیشانی ئاورێك بەفەرهەنگو فۆلکلۆری خەڵکانی گەرمین و کوێستانی کوردستاندا، ئەویتریان مێژووی ژیانی خۆم و باب و باپیرم).

پاش ڕاپەڕینی ڕووناکبیران بەتایبەت و کرێکاران و زەحمەتکێشان خەڵکانی ئێران بەگشتی، کۆتایی هێنان بەتەمەنی ٢٥٠٠ ساڵەی ڕژێمی شاهەنشاهی، بەتایبەت هەڵهاتنی شا کە لەسەرتاسەری گۆی زەویدا بستێك عەرزیان پێ ڕەوانە نەدەبینی ساتێك قەلب و قەوارەی سەرەتان تێنراوی تێدا بسرەوێنی، من و هەزارانی وەك من، لەمەرگی بەکاوەخۆی ناو بەندیخانەکانی ئێران ڕزگارمان بوو، ڕزگاری پاش چاوەڕوانی مەرگ و نەمان، بۆ من و وەك منەکان، منی بەکوڵێ تەجرەبەو موتالای چوارساڵ لەژێر حوکمی ئیعدام و حەپسی ئەبەددا ڕزگار بوو، تەجرەبەی پێشتری ناو بەندیخانەکانی (شاو سەدام و ...هتد) لەماوەی ١٠ ساڵ یەك بەدوای یەکدا، بۆ من کە موتالای باشترین کتێبی مێژوویی، فەلسەفی و ئەدەبیم کردبووە بژێوی ڕۆژ و لە ناو بەندیخانەم، بیرەوەریم لەخوێندنەوەی کتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخ، کەببوە بەردی بناغەی ئەندێشەو تێڕوانین و لێکدانەوەم لەفەلسەفەی عیلمی و فەلسەفەی ئیسلامی، بەتایبەت بەراوردکردنی کتێبی میعراج نامەی (حەزرەتی موحەممەد) کەهەزاران جار بۆ خەڵکانی موسوڵمانی نەخوێندەوارم خوێندبۆوە، (فقدان) نەبوونی کتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخ بەرهەمی بیروباوەڕی میرزا حەمەدەمین مەنگوری مێشکی جەنجاڵ کردبووم، ئاواتەخواز بووم جارێکی دیکە بەئازادی ئەو هەلەم بۆ برەخسێ هەرتك کتێبەکە واتە میعراج نامەو گەشتی ئەستێرەی مەریخ بخەمە بەر لێکۆڵینەوەو بەراوردکردن، بەدیقەت و ئازادانە بتوانم لەبەرابەریاندا هەڵوێست بگرم و نەزەری خۆم بەنووسراوێك هەتا ئەگەر زۆر کورتیش بێت دەربڕم.

لەگەڵ شەبەقی شۆڕشی خوێندکاران، کرێکاران و خەڵکانی ئێران و ڕزگاربوونم لەمەرگی بەکاوەخۆی ناو بەندیخانەو تێکەڵاوبوونی سەرلەنوێم لەناو جەرگەی خەباتکارانی چینایەتی و نەتەوایەتیدا، بەداخەوە بۆماوەی پتر لەچوار ساڵ ئەو ئاواتە گرینگەم فەرامۆش کرد، پاش پتر لەچوار ساڵ خەباتی ڕزگاریخوازی سەرجەم حیزب و کۆڕو کۆمەڵانی خەڵکانی ئێران، بەتایبەت کە کوردستانیان کردبووە سەنگەرو هێلانە داگیرکردنەوەی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەلایەن هێزی نیزامی جەمهوری ئیسلامیەوە، هەڵاتن و پەنابردن بۆ دەوڵەتی بەعسی بەغدا وەك دەڵێن لەترسی شاوڕ پەنا بۆمار بردن؟ تازە هەلم بۆ ڕەخساوە دوای ئاواتی ناو بەندیخانەم کەوم، بەڵام بەداخەوە بەشی گرینگ و بناغەی ئاواتەکەم کەکتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخە نایاب و دەست نەیافتەنی!؟ بەڵام میعراج نامەی پێغەمبەری ئیسلام، وەك تۆڵەکە زۆر هەرزان و بەلاش.

پاش کۆتایی شەڕی هەشت ساڵەی بەعسی بەغداو ئیسلامی تاران و کۆتایی هەلومەرجی شەڕی چەکداری و چریکی و خانەنشین بوونمان لەناو ئۆردوگای بەتێلی درووداری دەورەدراو، لەژێر سەیتەرەو چاودێری هێزی نیزامی دەوڵەتی مەرکەزی بەعسی بەغدادا، ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا کە بەشێك لەبەرهەمەکانم چاپ و بڵاوکەمەوە، بەچاپ کردن و بڵاوبوونەوەی برێك لەبەرهەمەکانم بەتایبەت ڕۆمانی سارا، ئەمجار ڕۆمانی سارا زیاتر لەبەرهەمەکانی ترم بوو بەپێناسەم لەلای خوێندەواران و ڕووناکبیران و کتێبخانەو کتێبرۆشیەکان، بەتایبەت لەناوچەکانی سلێمانی و هەولێر.

لەگەڵ کۆتایی شەڕی خەلیج و ڕاپەڕینی خەڵکی چەوساوە، بەتایبەت زەحمەتکێشان و کرێکاران و ڕووناکبیرانی چەپ، وە گەڕانەوەی دوو حیزبی گەورەی شکست خواردووی دەستەمۆی داوێنی جەمهوری ئیسلامیدا ڕزگاربوونی ٣ پارێزگە واتە سلێمانی، هەولێرو دهۆك، ئا لەو هەلومەرجەدا بۆ حیساب ڕەسی بڵاوەو فرۆشی ڕۆمانی سارا، بەسەر کتێبفرۆشی شارە ڕزگارکراوەکاندا دەگەڕام، لەعەینی حاڵیشدا بەدوای کتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخیشدا عەودالٌ و لەپرس و جۆدا بووم، لەیەکێك لەکتێبفرۆشیەکانی شاری ڕانیە خاوەن کتێبخانەکەم خستە ژێر پرسیار وتم:

-زۆرم پێ سەیرە کتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخ کە نووسەرەکەی زادەی ئەم هەردوو بوومەیە، بەر لەبیست ساڵ لەسەردەمی حەیاتی خۆیدا لەچاپی داوە، کەچی لێرەشدا کتێبەکەی نایاب و دەست نەیافتەنیە، بۆ!؟

خاوەنی کتێبخانە وتی: یادی بەخێر مەنگوری هەلێکی (زوود گوزەری) وەك هاڵاوی گرەی گرالك بۆ هەڵکەوت، چەن بەشێك لەبەرهەمە بەنرخەکانی بەچاپ گەیاند، بەڵام بەداخەوە برێکیان بەتایبەت ئەوەی مەبەستی تۆیە، وەك گرەی گرالگ هەڵگیرا خۆڵەمێشەکەیشی وەبەر ڕەشەبا کەوت؟! بەفەنا چوو؟!

ئەم شیکردنەوە پتر تینوو تامەزرۆی مەبەستی کردم، بەنیگەرانیەوە وتم:

-تۆ بڵێی لەهیچ کونی سوممەو سوڕاخێکدا بەئامانەت وەچنگمان نەکەوێ؟

-بەخوا لەلای کەسێك نوسخەیەك شك دەبەم، بەڵام بەباوکیشی نادات.

وتم وەرە بەختی من تاقیکەرەوە، بەشکەم بۆماوەی چەن ڕۆژ بمداتێ، وتی:

-بەخوا بەخوێندنەوەی ڕۆمانی سارای تۆ، تینووی دیتنی تۆیە، تێدەکۆشم بەیەکتان بناسێنم، ئەوسا تۆیش دەتوانی ڕووی لێبێنی، بەشکەم بەئامانەت بتداتێ، سەرەنجام کات و ساتی دیداری بۆ دیاریکردین.

لەکات و ساتی دیاریکراودا چوومە سەر وادە، لاوێکی تەقریبەن تەمەن ٣٠ ساڵە تۆزێك لەپێش چاوم ئاشنا، بەرێزو حورمەتەوە



لەبەرم هەستا وتی:

-مامۆستا میرزا عەلی تۆمن ناناسی، بەڵام من تۆ باش دەناسم بەتایبەت بەهۆی ڕۆمانی سارا و تەرجەمەی (دایەجۆنن)ەوە، چەن ڕۆژێکیش وەك کرێکارێکی بیناسازی لەدۆڵی بۆتی لەژێر سەرپەرشتی کردنی تۆدا کارم کردووە، ئەمەیش کتێبی گەشتی ئەستێرەی مەریخ کە بەقەد چاوم خۆشم دەوێ بەئامانەت دەتدەمێ، بەڵام لەبەرئەوەی ئێستا ئێوەش پەتای جیایی و تەفرەقە کەوتۆتە نێوانتان، تۆ لێرە نەماوی بەشێکی بەرچاوتان بەرەو ئەورووپا تێیان قووچاندووە، دەترسم نەتۆو نەکتێبەکەم نەبینمەوە، بەسوپاسەوە وتم: بەڵێنت دەدەمێ وەك گلێنەی چاوم بیپارێزم و ئەگەر هەلیشم بۆ هەڵکەوێ چاپ و بڵاویشی دەکەمەوە بەدڵنیایی و ڕوالەتی

گەشـەوە وتـی: من لەهەلومـەرج و توانـای مـالّی مـەحروومم، دەنـا لەمێژە چاپ و بلاوم کردبۆوە، بەلام دلنیام هەلومـەرجی ماددی و مەعنـەوی بـۆ تـۆ دەرەخسێ، بەوهیوایـەی هونـەرو ئـەدەب و ئەندێشەی مەنگوری فەرامۆش نەکەی و بەلێنەکەت بەریتە سەر، ئەو ئەرکە قورس و گرینگە بەئەنجام بگەیەنی.

تەنیا دوومانگ پاش ئەو دیدارو بەلێن و باس و خواسە بوو، کە بەناچاری و نەبەدلّی ئامادەی سەفەر، باشترە بلێم ئاوارەی ئەورووپا بـووم، تـەواوی کتێبخانەکـەم بـەکتێبی ئەسـتێرەی مەریخـەوە بەئامانـەت بـەکاك برایمـی شـێخ مەجیدم سپارد، بەوهیوایـەی کـە لەئـەورووپا سـەقامگیر بـووم دەسـتەیاوم پێـی بگـات لەگـەلّ بەرهەمەکانی خۆمدا چاپ و بلاویان بکەمەوە.

پاش تێپەڕبوونی ٨ سال جا هەلم بۆ هەلکەوتەوە، بۆ سێهەمین جار بەدیـداری کتـێبی ئەسـتێرەی مـەریخ شـادو شـوکور ببمـەوە، بڕیارمـدا خـۆم پێشەکییەکی بۆ بنووسم و میعراج نامـەی فـەخری عالەمیـشی دەقـاودەق پێـوە چـاپ و بلاوبکەمـەوە، تـا تـوانیبێتم بەتەجرەبە لەهەلوێستی حاجی مامۆستاو برای رووناکبیری کتێب فرۆشی ٣٠ سالّ لەمەوپێشی قەیسەری نەقیب و بەلێنێك کە بەبرای کرێکـارو رووناکبیری شـاری رانیـەم دابـوو، بەتایبـەت ئەمانـە کەتێکەلاوێکن لەحەزو ئارەزوو ئاواتم و پێکەوە تێك هەلپێکراون، هەلومەرجی ڕەخساو لەچنگ نەدەم، ئەم بەشە گرینگەیش لەئاواتە دێرینەکانم بەئەنجام بگەیەنم.



مـن بۆخـۆم ئـەو دوو میعـراج نامەیـەم بـەوردی لێکداوەتـەوەو هـەلّم سـەنگاندون و تـاووتوێم پێکـردون، بەشانازییەوە دەلێم ماناو مەفهوم و تام و چێژی گەشتی ئەسـتێرەی مـەریخ، بـوون بەبەشێك لـەو شـۆڕو شـەوقەی کەشۆڕشـی فیکریـان لەمێـشکمدا خولقانـدو لـەناو نووسینەکانمدا ڕەنگیـان داوەتـەوە، لێرەدا هـیچ نـالێم و هیچ نانووسم لێکدانەوەو تەفسیرو شیکردنەوەی ئەم دوو بەرهەمی فیکری و بیرو بۆچوونانەی محەمەدی عەرەبی و محەمـەدی کـوردی، بـە (ئەسـلّەکان) بـەرەکانی نـوێی و نوێخوازی ئێستاو داهاتووی کوردو عەرەب دەسپێرم تا بەتێرو تەسەلی بناسرێن، من تەنیا ئەوە دەلێم:

بەپێی چەند (جوملە)ی کورت کە مەنگوری بۆ خۆی لەپێشەکیەکەیدا نووسیویەتی: دەلێ: زۆر شتی سەیرترو درێژترم بەرچاو کەوتووە، بەلام لەبەر هەندێ گیروگرفت و کۆسـپی نالـەبار جـارێ لەچـاپکردن و گێرانـەوەی وازم هێناوە.

زۆر روون و ئاشکرایە ئەو کۆسپ تەگەرە نالەبارانەی مەنگوری لێیان ترساوە عەبدالخالق مەعروف نەترسانەو بوێرانە بەپێشوازیانەوە چوو و لەقاوی دان.

یەکەمین مرۆڤی کورد بوو کەتاجی فیداکاری فیکری لەمێژووی گەلی کورددا، نایە سەر، شەی یادان و شەعبە دەبازان و سیاسەتمەدارانی ریسواکرد.

بێگومانم: مـەنگوری جگـە لەبایـەگانی ئاومێشکی کـە بەداخـەوە بەلەشـیەوە بردوویەتـە گـۆڕەوە، زۆر زانیـاری بەنرختریـشی فـەوتاون، دلنیـام لەئایەنـدەدا، یـادی ئـەم نوسەرو ئەندێشمەندە کوردە، بۆ هەمیشە بەرزو بەرێزتر دەبێت.

## پاشکۆیەکی کورت

خوێنەرانی خۆشەویست منیش وەك مامۆستا (مەلا زبێر حافظ نەزێر عیراقی) خۆم بە بەختەوەرو سەرفراز دەزانم کەئەم حەدیسە نەبەویە کە لەئایەتی قورعان و زمانی خودی موحەمەد پێغەمبەری موسڵمانەوە نەقڵ کراوە نزیکەی ١٢٠٠ ساڵە بۆ ئوممەتی موحەمەد دەخوێندرێتەوە، پێش هەزار ساڵیش تائەم چەند ساڵانەی دواییە لەگەورەترین زانستگای ئیسلامی واتە جامع ئەزهەری میسر بەدەرس وتراوەتەوە، لەگەڵ گەشتی ئەستێرەی مەریخی نووسینی میرزا حەمەدەمین مەنگوری کە (تقابل) لەگەڵ میعراجنامەی فەخری عالەمدا نووسیویەتی، پێکەوە چاپیان بکەم، لێکدانەوەو شیکردنەوەو قەزاوەت بەخوێنەران بەتایبەت (نەسڵەکان) بەرەکانی نوێ و نوێخوازی ئێستاو داهاتوو دەسپێرم.

لێرەدا بۆ وەبیرهێنانەوەی مامۆستایانی صادق و سالمی ئیسلامی (نەقڵ قەوڵێك) لەمێژوونووسانی بێلایەن دێنمەوە، دەڵێن لەوکات و ساتەدا کەپێغەمبەری ئیسلام باسی میعراجی بۆ قەومی عەرەب بەتایبەت قورەیش دەگێڕایەوە، ئەبوجەهل مام و نەیاری حەزرەتی موحەمەد هەڵدەستێتە سەرپێ و دەڵێ:

ئەی موحەمەد خواست و پرسیارێکم لێتە، بەشایەتی گشت قەومی عەرەب کەلێرەن ئەگەر جوابی دورستم پێ بدەیتەوە هەر ئێستاکە ئیمانت پێدێنم و دەبمە عەبدی خوای خەیاڵی و ئومەتی تۆ؟ پێغەمبەر بەئیتمینان و رووی گەشەوە دەفەرموێ:

-یلێ ئامادەم بۆ ئەنجامدانی خواست و وەڵامی پرسیارەکانت.

ئەبو جەهل دەڵێ:

-هەستە سەرپێ و چوار بست لەدیوارەکە فاصیلە بگرە؟ پێغەمبەر هەڵدەستێ و بڕێك دوور لەدیوارەکە رادەوەستێ، ئەبو جەهل دەڵێ: بێزەحمەت لاقێکت هەڵبڕە، کەفەخری عالەم بەقصەی دەکات، ئەبو جەهل دەڵێ: ئێستا بێ ئەوەی لاقە هەڵبڕاوو نوشتاوەکەت بێنیتە سەر عەرز ئەوی تریشت هەڵبڕەو بینوشتێنەوە، تەنیا چارەکە سەعاتێك بەحەواوە لەپێش چاوی ئێمە ڕاوەستە بۆ من بەسە، هەر ئێستا باوەڕت پێدەکەم و ئیمانت پێدێنم، دەبمە ئوممەتت؟

کە ئەبو جەهلی زیرەك و زۆرزان پێغەمبەر غافڵگیر دەکات، پێغەمبەر بەحەپەساوی لاقە هەڵبڕاوو چەماوەکەشی دەهێنێتە زەوی.

ئەبوو جەهل دەدا لەبانگەشەو قاوو قاقای پێکەنین و دەڵێ:

-خزمینە نەمگوت محەمەد مەجنوونە جندۆکان دەستیان لێ وەشاندوە؟!

(خوێنەرانی خۆشەویست بەشایەتی و نەقڵی قەوڵی هەر هەموو مێژوونووسانی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی، هەر هەموو قورعان و حەدیسەکانی موحەمەد پێغەمبەری ئیسلام نەقڵی قەوڵن لەخودی پێغەمبەرەوە، پێغەمبەر لەحاڵی حەیاتی خۆیدا نە تاقە ئایەتێکی قورعان و نە تاقە دێڕێك حەدیسی خۆی نەنوسیەوەو نەیهێناوەتە سەر کاغەزو ئیجازەی نەداوە بینووسنەوە، بۆچی!؟).

ئەی نەوەی نوێ و نوێخوازانی کۆتایی چەرخی بیستەم و سەرەتای چەرخی بیست و یەکەم، ئەی ئەو کەسانەی بەچاوو گوێ لەشاشەی سەدان تەلەفزیۆن و کەناڵە ئاسمانیەکانی جیهانەوە وەزعی منداڵان، لاوان، ژنان و پیاوانی زەحمەتکێش بەتایبەت ژنانی ئەفغانستان و ئێران و... بەچاوی خۆتان دەبینن و دەبیستن.

ئەی ئەو کەسانەی لەدوورو نزیکەوە شاهیدو چاودێری کۆچ و رەوی بەکۆمەڵ و بەلێشاوی جیهانی بەگشتی و بەتایبەت خەڵکانی کوردو فەلەستین و ئەفغانی و رواندایی و... ئەی ئەوکەسانەی شاهیدی قەتل عامی نیو ملیۆن خەڵکی رواندا بووین لەماوەی حەوتویەك دا، ئەی ئەو کەسانەی هەر ئێستاکەیش شاهیدن رۆژانە خەڵکانی کوردو ئەفغانی و ئێرانی بەکۆمەڵ، بە بەلەم و کەشتیە شکاوی لەڕەدە دەرچووی سەودا گەڕانی مەرگ و قاچاخچیانی مرۆڤ لەبەحرەکاندا سەرگەردان و نوقم دەبن، ئەی ئەو کەسانەی لەجەهەنەمی ئەمیرولموئمینین مەلا موحەمەد عومەرو ویلایەتی فەقیهی جەمهوری ئیسلامی و حکومەتی رەگەزپەرستی تورك هەڵهاتون خۆتان گەیاندۆتە وڵاتانی ئەوروپا.

ئەی ئەو کەسانەی لێرە لەجەرگەی وڵاتانی (موتەمەدنی) ئەوروپا شاهیدی ئەو جینایەتانەن لەئیرلەندو ئیسپانیادا روودەدات، ئایا دەزانن بانی و بناغەی بەدبەختی و رۆژە رەشی ئەفغانی و ئێرانی و ئیرلەندی چیەو چین؟؟

بەبڕوای من ٣ شتە، حیزب و مەزهەب و بازارە، تامەنجەڵە چێشتی کۆمەڵگای بەشەری لەسەر ئەم سێ کوچکەی ئەم کوانووە بێت، ئەو چێشتە بۆ تاقمێکی یەکجار کەم گەوارایەو بۆ باقی کۆمەڵگای مرۆڤ بەگشتی سەرەتانە، وەك بیستوومانەو دەیبینین هەمیشە جەستەی کۆمەڵگای داڕزاندووەو دادەڕزێنێ.

ئەوەی میرزا حەمەدەمین بەخەو خەیاڵ لەسەر گوێ مەریخ بینیویەتی و باسی کردووە، بەبڕوای من گشتی خەوو خەیاڵ نییە، هەر ئێستاکە ئێمە نموونە هایەکی لەناو یاساو پراتیکی وڵاتی سوید دەبینین و لێی بەهرەمەندین.

دڵنیام ئەگەر خوێنەرانی گەشتی ئەستێرەی مەریخ بەوردی بچنە ناو قووڵایی مەتن و مەحتوای ئەم بەرهەمە ئەدەبی و هونەری و فەلسەفیەوە، بەباشی بۆش و بلێری ئەمریکایی و ئینگلیسی و خامنەیی نوێنەری خواو پێشەوای شیعەو ئەمیرولمونمنینی ئەفغانی پێشەوای ئەهلی سوننت بەباشی دەناسن.

٢٠٠١/١٠/٣٠

